ناوی کتێب: فەتوای هاوچەرخ بۆ ئافرەتان

ناوی ئامادەکار: ئەسرا مجید سەعید

بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن هەولێر

خەت: ئەوزاد کەریم

دیزاینی ناوەوە: جمعة صديق كاكە

بەرگ: ئەمین موخلص

نۆرەو ساڵی چاپ: پێنجەم ١٤٣١ك - ٢٠١٠ز

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٣٧٦)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

**تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٥١٨١٢٨

مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٣٢ - ٠٧٧٠ ١٢٨ ٧٢ ٩١

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

# فەتوای هاوچەرخ
# بۆ ئافرەتان

ئامادەکردنی

**نەوا محمد سعید**

چاپی پێنجەم

١٤٣١- ٢٠١٠



پێشکەشە بە :

* هاوسەری دڵسۆز و بەسۆز و بەوەفاو

هەستدارم (شنۆخان)، کە لە رۆژانی سەخت و

دژوار و ئاوارەییدا دڵنەواو ئارامگام بووەو،

وەک ئافرەتی سەحابەئاسا، لە نەهامەتیەکان

پشتگیر و دەستبارم بووە، بەردەوامیش لە

کاری چاکە هاندەرمە.

* بە رۆڵەکانم: ( سارا ) ، ( محمد )، ( ئەلند ).

* ئەو ئافرەتانەی پابەندن بە یاساکانی ئیسلام.

# پێشەکی چاپی پێنجەم

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهان، هەزاران سڵاوو ڕەحمەت بڕژێ بەسەر پێغەمبەرو یارو یاوەرانی تا ڕۆژی دوایی.

دیارە ئافرەتان جیهانێکی فراوانن، کە فەتوا دەربارەیان، چەندەها پرسیاری تازەو نوێ لەخۆ دەگرێ.

هەڵبەت ناتوانین سەرجەم فەتواکان لە کتێبێکی قەبارە بچوکدا بخەینە ڕوو، مەگەر تەنها دوای بژاردەکردن‌و پوختەکردن‌و گوڵبژێرەوە دەکرێ.

ئەم پرسیارو فەتوایانەی، کە ئەم کتێبە لەخۆی گرتووە، ڕەنگە هەندێك پرسیاری هەستیار بن، کە ئافرەتان لەڕویان نایێ‌و شەرم دەکەن ڕاستەوخۆ ئەم جۆرە پرسیارانە بکەن. هەربۆیە

بە پێویستم زانی ئەم ئەرکە زۆر پیرۆزە بگرمە ئەستۆو، گرێ ئاڵۆزەکان بە یارمەتی خوا لەڕێی ئەم چەند پرسیارە هەڵبژاردەیەدا بکەینەوە.

ستایشی بێپایان بۆ خوای بەخشندە، کە ئەم کتێبە بۆ جاری پێنجەم بە چاپێکی قەشەنگ چاوی خوێنەرانی ڕۆشن دەکاتەوە.

نەوا محمد سعيد

١٤٣١/٦/١٧ك

٢٠١٠/٥/٣١

## دەنگی ئافرەت عەورەت نیە

**پ١/ ئایا دەنگی ئافرەت عەورەتە، بە واتای حەڕامە، یان حەلاڵە؟**

وەڵام/ ئەسڵ و بنەڕەت لەشتدا حەلاڵە. حەڕامکردنی هەرشتێك مافی خوای پەروەردگارە، ناتوانرێ بەشتێك بوترێ حەڕام، ئەگەر دەقی ڕاشکاوی لەسەر نەبێت.

ئەمە مەبدەئی بنەڕەتییە لە شەریعەتی ئیسلامدا. جا بۆ حەلاڵ وحەڕامکردن، لەسەرمان پێویستە داوای بەلگەبکەین، لەبەرئەوە ئەسڵ لەشتدا (مباح)ە.

بەبۆچوونی جەماوەری شەرعزانان (جمهور الفقهاء) دەنگی ئافرەت بە عەورەت دانانرێ. بەلگەشیان ئەو فەرموودانەیە، کە ئافرەتان بەیعەتیان بە پێغەمبەر ﷺ داوە. بوخاری لەخاتوو عائیشە ڕیوایەت دەکات، کە گوتوویەتی:

**((كان النبي ﷺ يبايع النساء بالكلام...))**، واتە: پێغەمبەر خوا بەیعەتی لە ئافرەتان بەقسە وەردەگرت. ئوم هانی- کە کچی مامی پێغەمبەر بووە، هاتۆتە لای پێغەمبەرو سەلامی لێ کردووەو وەڵامی لەلایەن پێغەمبەرەوە دراوەتەوەو قسەی لەگەڵ کردووە. هەروەها ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوایان لێبێ)، دوای مردنی پێغەمبەر ﷺ بەمەبەستی سەردانی چونەتە لای ئوم ئەیمەن و سەلامیان لێکردووەو قسەیان لەگەڵ کردووە.

کەواتە دەنگی ئافرەت بۆ پیاوی بێگانە لەکاتی پێویستیدا ڕێگە پێدراو (مباح)ە. ئەمەش بەمەرجی پابەندبوونی ئافرەتەکە بەئادابی ئیسلامی، کە ئەویش قسە نەکردنیەتی بەناسکی و بەنازی و نەرم و نیانی، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾(الاحزاب-٣٢)،

واتــــە: ئافرەتـــە مســـوڵمانەکان نابـــێ لـــە قسەکردنیاندا، ناسکیو نەرمو نیانیان تێدا بێت، نەبادا پیاوی دڵ نەخۆش، بەهۆی گوێ لێبوونی بەو دەنگە ناسکە، نیازو مەرامی خراپی لەلا دروســت بێــت، لەبەرئــەوە بــە دەنگێکــی مــام ناوەندی قسە بکەن، کە ناسك نەبێت (فتاوى النساء العصرية).

## ئافرەت بۆی دروستە قژی ببڕێ

**پ٢/ ئایا ئافرەتی مسوڵمان بۆی دروستە قژی ببڕێو کورتی بکاتەوە؟**

وەڵام/ گەر ئافرەت قژی ببڕێ بەمەبەستی لاسایی کردنەوەو خۆ چواندن بەئافرەتی بێگانە، یان خۆ چواندن بەپیاو، ئەوا حەرامە قژی ببڕێ. بەڵام گەر ئەو مەبەستەی، نەبێت ئەوا بۆی دروستە قژی ببڕێو کورتی بکاتەوە. وەکو موسیلم ریوایەتی کردووە لە ئەبی سەلەی

کوڕی عەبدولڕەحمان، کە گوتویەتی: منو برای شیری خاتو عائیشە، چوینە لای خاتو عائیشە، ئەو پرسیاری کرد سەبارەت بە شوشتنی جەنابەتی پێغەمبەر ﷺ... خاتو عائیشە فەرموی: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ قژیان دەبڕیو کورتیان دەکردەوە، تا دەگەیشتە سەر گوێچەکەیان کەلەوێوە تێپەڕی نەدەکرد.

## ئافرەت گەر نەخۆش بوو بۆی دروستە بچێتە لای پزیشکی پیاو

**پ٣/ ئافرەت گەر نەخۆش بوو، ئایا بۆی جائیزە بچێتە لای پزیشکی پیاو؟**

وەڵام/ بۆ چارەسەرکردن واباشترە ئافرەت بچێتە لای پزیشکی ئافرەت، بەڵام گەر لە شارێك پزیشکی ئافرەت نەبوو بۆ جۆری نەخۆشییەکەی، ئەو کاتە جائیزە بچێتە لای پزیشکی پیاوی مسوڵمانی چاكو پاك داوێن، کە

پێویسته مەحرەمی لەگەڵ دابێت، جا ئەگەر پزیشکی پیاوی مسوڵمان نەبوو، ئەوکاتە بۆی هەیە بچێتە لای هەر پزیشکێك. هەروا لە کاتی پێویستیدا پیاو بۆی جائیزە تیماری ئافرەت بکات‌و، ئافرەتیش تیماری پیاو بکات. (عن ربیع بنت معوذ بن عفراء قالت كنا نغزو رسول الله ﷺ نسقي القوم ونخدمهم ونرد القتلى والجرحى الى المدينة) رواه البخاري.

حافظ لەکتێبی (الفتح)دا گوتویەتی: لەکاتی زەرورەتدا جائیزە پیاوی بێگانە تیماری یەکتری بکەن بەئەندازەی پێویست بوون بە تەماشاکردنی ئەو شوێنە نەخۆشەو دەست لێدانیشی.

ئیبن مفلح لە کتێبی (الاداب الشریعة)دا گوتویەتی: گەر ئافرەتێك نەخۆش بوو، جگە لەپیاو ئافرەتی لێنەبوو چارەسەری بکات، ئەوا ئەو پیاوە بۆی جائیزە تەماشای شوێنە نەخۆشەکە بکات، کە پێویست بەتەماشاکردن دەکات. تەنانەت پاش‌و پێشیش (الفرجين)، پیاو

لەگەڵ پیاویش بەهەمان شێوە.

ئیبن حەمدان گوتویەتی: گەرپیاو نەخۆش کەوتو، جگە لە ئافرەت کەسی تر نەبوو چارەسەری بکات، ئەوا بۆ ئەو ئافرەتە دروستە تەماشای ئەو شوێنە بکات، کە پێویست بە تەماشاکردن دەکات، با پاش و پێشی پیاوەکەش بێت.

قاضي گوتویەتی: پزیشك بۆی هەیە لەکاتی پێویستیدا تەماشای عەورەتی ئافرەت بکات، هەروەها جائیزە بۆ تیمارکردن ژن و پیاو تەماشای عەورەتی پیاو بکەن لەکاتی زەرورەتدا. (فقه السنة، بەرگی یەکەم، سید سابق).

## ژن بە ئیزنی مێردەکەی بۆی هەیە لە ماڵی مێردەکەی ببەخشێت

**پ٤/ ئایـا ژن بـۆی هەیـە لـەماڵی مێردەکـەی ببەخشێت؟**

وەڵام/ نـەخێر، ژن بـێ ئیزنـی مێردەکـەی بـۆی حەڵاڵ نیە لە ماڵی مێردەکەی ببەخشیو خێـر بکـات. وەك پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی: ((لاتنفق امراة شيئا مـن بيـت زوجها الا بأذنـه، قيل : يا رسول الله ولا الطعام؟! قال ذلـك افضل اموالنا)) رواه الترمـذي- حـديث جيـد، واتـە: ژن لـە مـاڵی مێردەکـەی بـەبێ ئیزنـی مێردەکـەی هیچ شتێك نەبەخشێت، گوترا ئەی پێغەمبەری خـوا خـواردنیش نابـێ ببەخشـێت؟ فـەرموی: خواردن باشترین ماڵو سامانمانە.

# ئافرەت بۆی دروستە دەم‌وچاوی بۆ مێردەکەی بکات

پ/٥ ئایا ئافرەت بۆی جائیزە مووی دەم‌و چاوی بۆ مێردەکەی بکات؟

وەڵام/ کردنی مووی دەم‌و چاو بە موکێش (منقاش) حەرامە، حەنبەلییەکان ڕێگەیان بە کردنی مووی دەم‌و چاوداوە.

لە کتێبی (المغني) ابن قدامة الحنبلیدا هاتووە: (دەربارەی مووی دەم‌و چاو- مهنا- گوتویەتی: پرسیارم لە ئەبو عبدالله کرد واتە- ئیمام ئەحمەد- سەبارەت بە لابردنی موو، ئەویش فەرموی: بۆ ئافرەت قەیناکات، بەڵام بۆ پیاو بە باشی نازانم.

جا حەنبەلییەکان موهەڵگرتن واتە: بە مووکێش بە حەرام دادەنێن، بەڵام تاشین‌و لابردنی موی ڕوخساریان ڕێگە پێداوە.

چونکە هەڵگرتن بە موکێش، موو لەڕەگەوە دەردێنێ، کە ئازار، یان زیان بە ڕوخساری

ئافرەتەکە دەگەیەنێو، ئاسەوار بەجێ دەهێڵێ، بەڵام بە لابردنو تاشین، موو لە ڕەگەوە هەڵناکێشێو، زیان بە ئافرەت ناگەیەنێ.

خاوەنی کتێبی (المفصل في احكام المرأة) دکتۆر عبدالکریم زیدان دەڵێ: بۆچونی حەنبەلیەکانم پێ ڕاستە بۆئافرەتی مێرددار، کە بتوانێ دەمو چاوی بکات بۆ مێردەکەی، بەڵام بۆ ئافرەتی شوونەکردوو وانابینم جائیز بێت، چونکە خۆ جوانکردنی تێدایە، کە تەنها ئەو خۆ جوانکردنە بۆ مێردەکەی جائیزو شایستەیە، دەمو چاوکردنیش عەیب داپۆشەری ڕوخسارە، کە ئەمەش دەبێتە چەواشەی خوازبێنیکەری ئەو کچە.

بەڵگەی حەنبەلیەکانیش ئەوەیە، کە لە (فتح الباري بشرح صحيح البخاري) ابن حجر العسقلاني هاتووە، کە (طبري) لە ڕێی ئەبی ئیسحاق تەخریجی کردووە لە خێزانەکەی: ((انها دخلت على عائشة ام المؤمنين رضي الله عنها

وكانت- اي امرأة ابي اسحاق- شابة يعجبها الجمال. فقالت: المرأة تحف جبينها لزوجها فقالت عائشة رضي الله عنها: اميطي عنك الاذى ما استطعت))، واتە: خێزانی ئەبی ئیسحاق، کە گەنج بووەوە حەزی بە جوانی کردووە، چۆتە لای خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ)، پرسیاری کردووەو گوتویەتی: ژن دەمو چاوی بۆ مێردەکەی بکات، ئایا چی بۆ هەیە؟ خاتو عائیشە فەرموی: ئەو موانەی، کە دەبێتە مایەی ناشیرین کردنت، بەگوێرەی توانا لایبە.

## ئافرەت خۆی بۆ مێردەکەی ئارایش بکات ناچێتە قالبی (تغير خلق الله)

**پ٦/ ئافرەتی مێردار کەخۆی بەم بۆیەی ئێستا ئارایش دەکات، ئایا ئەمە دەچێتە قالبی (تغير خلق الله)؟**

وەلام/ پێویستە بزانین چ شتێك دەبێتە گۆڕانی دروستکراوی خوای گەورە؟ ئیمام شەوکانی گوتویەتی: ڕوالەتی گوتنی(المغيرات لخلق الله) کە لە فەرموودەدا هاتووە ئەوەیە، کە نابێ هیچ شتێك لەو سیفەتەی، کە هەیەتی، گۆڕانی بەسەردابێ، گوتراویشە: بەلکو ئەوەی، کە دەچێتە قالبی (تغير)ەوە ئەوەیە، کە ئەو گۆڕانکارییەی بەسەری دادێت، بە هەمیشەیی بمێنێتەوە، بەلام ئەو گۆڕانەی، کە کاتییەو بە هەمیشەیی نامێنێتەوە وەکو: (کل‌و بۆیە) ئەوا ئیمام‌و زانایانی تریش ڕێگایان پێداوە.

خاوەنی کتێبی (المفصل في احكام المرأة) دەڵێ: ئەوەی بە ڕای پەسەندی دەزانم، وەرگرتنی ئەو

فـەهم‌و تێگەیشـتنەیە، کـە ئـەو گۆڕانکارییـە حەرامـە، کـە بـە هەمیشـەیی بمێنێتـەوە، بـەڵام ئەوەی کە ئاسەوارەکەی نامێنێتەوە، ئەوا عـەفوی لێـدراوەو قەدەغــە نــەکراوە. لەبەرئــەوە دەردەکـەوێ، کـە ئـەو بۆیـەو بۆدرانـەی ئافرەتـان لـەدەم‌و چاویان دەدەن، یـان لێویـانی پـێ جـوان دەکەن بۆ مێردەکانیان، کە دەکرێ بە ئاو، یان بە ئـاوو صـابون، یـان بـە شـلەیەکی دیـاریکراو لادەچێت، ئەوا بەکارهێنانی ناچێتە قالْبی (تغیر خلق الله)و دروستە.

# ئافرەت دەتوانێ کەرستەی ئارایش کردن بەکاربهێنێ

پ٧/ کەرستەی ئارایشت کە هەندێکیان بۆدرەن و هەندێکی تر رۆن (زیت) وە بە شێوەو ڕەنگی جیاجیا هەیە بۆ جوانکردنی پەنجەکان و بۆیەکردنی دەم و چاو، ئایا بەکارهێنانیان جائیزە؟

وەڵام/ شافیعی یەکان گوتویانە، وەك کە ئیمام نەوەوی لێیانەوە نەقل دەکات و دەڵێ: (سورکردنی دەم و چاوو بۆیەکردنی قژ بە ڕەنگی ڕەش و، بۆیەکردنی نینۆکی پەنجەی ئافرەت بەبێ ئیزنی مێردەکەی حەرامە،بەڵام ئەگەر بەئیزنی مێردەکەی بێت ڕای پەسەند ئەوەیە، کە جائیزە. کە ئەمەش کورتەی قسەی هاوڕێیانمانن سەبارەت بەم مەسەلەیە).

لەبەرئەوە شافیعیەکان ڕێگە بە سورکردنی ڕوخسار دەدەن، ئەمەش بەمەرجی ئیزنی مێرد، ئەگینا حەرامە. بەڵام بۆ ئافرەتی شوونەکردوو

(کچ) بە جائیزی دانانێن.

هەنـدێك لـە حەنبەلیـەکان وەك ابـن حجـر العسقلانی. لێیانەوە نـەقل دەکات، کـە گوتویانـە: سورکردن و نینۆك بۆیەکردن، گەر بـەئیزنی مێـرد بێت ئەوا جائیزە. جا گـەر سورکردنی دەموچاو لای شـافیعییەکان جـائیز بێـت، ئـەوا لێـو سورکردنیش جائیزە. چونکە لێو لە چوارچێوەی ڕوخسـارە، بـا بەڕاشـکاویش باسـیان نـەکردبێت. هـەروەها بۆیـەکردنی نینـۆك بـەو ڕەنگـەی، کـە ئافرەتەکە دەیخوازێت جائیزە، بـەڵام بەمـەرجێك ماددەیەك نەبێت ئاو تەڕی نەکات، وەکو ئـەوەی، کـە ئێستا باوە (بۆیـەی نینـۆك) واتـە ئـەو بۆیـە قەتماغـەدارەی ئـەمڕۆ، ئـەوا جـائیز نیـە، چـونکە نینۆنەکەکان تەڕ ناکات، بەڵام کاتێـك ئـافرەت لـە حەیزدایـە، دەتوانـێ بـەکاری بێنـێ، تـا پـاك دەبێتەوە.

(المفصـل في احكـام المـرأة، د.عبـدالكريم زيـدان، الجـزء الثالـث، الطبعة الاولى، ١٤١٣-١٩٩٣م).

## مانای وشەی ( جلباب )

**پ ٨/ وشەی (جلباب) کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، ئایا چ پۆشاکێك دەگرێتەوە؟**

وەڵام/ خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾(الاحزاب- ٥٩)، واتە: ئەی پێغەمبەر بە خێزانەکانتو کچەکانتو ئافرەتە باوەڕدارەکان بڵێ: با (جلباب) بەسەر خۆیان دابێننە خوارەوە، کە ئەمەش دەبێتە مایەی ناسینیان بە ئافرەتی داوێن پاكو عیففەت، کە لەلایەن خەڵکانی فاسقو فاجرەوە، ناتوانرێ خراپەیان بەرامبەر بکرێتو، توانجو تانەیان پێ بگوترێ.

**جلباب چەند پێناسەیەکی هەیە لەوانە:**

* جلباب بریتیە لەو پۆشاکەی، کە لە سەرەوەی لەش تا خوارەوەی لەش دادەپۆشێ وەك، کە

لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەت کراوە.

١- جلباب بریتیە لەو پۆشاکەی کە ئافرەت خۆی پێ دادەپۆشێ.

٢- جلباب بریتیە لە پۆشاکێکی فراوان، کە خۆی پێ دادەپۆشێ.

٣- جلباب بریتیە لە کراس.

٤- جلباب گشت بەرگ‌و پۆشاکێکە، کە ئافرەت لەسەر جلەکەی لەبەری دەکات.

٥- جلباب ئەو عەبایەیە، کە ئافرەت لەسەر کراس‌و سەرپۆشەکەیدا دێنێتە خوارەوە.

★ ڕای پەسندی سەبارەت بە مانای جلباب:

ابن العربي مالکی لە تەفسیری ئایەتی (یدنین علیهم من جلابیبهن)دا دەڵێ:

لە بێژە(لفظ)ی (جلباب)دا خەڵك جیاوازیان هەیە، ئەمەش لەبەر نزیکی ماناکەیەوە. ئەوەی، کە ڕاستە جلباب ئەو پۆشاکەیە، کە لەش دادەپۆشێ.

دەکرێ وەسفی جلباب بەگوێرەی پێناسەکەی

کورت بکرێتەوە، کەبریتیە لە پۆشاکێکی فراوان، کە لەسەر جلو بەرگی ئافرەتەوە لەبەردەکرێو گشت لەشی لە سەریەوە، تادەگاتە پێیەکانی دادەپۆشێ. جا لەژێر تیشکی ئەو وەسفانەو پێناسەکاندا، دەکرێ ئەم پێناسەیەی بۆ هەڵبژێرین:

(جلباب) بریتیە لەو عەبایەی، کە ئافرەت لەسەر جلەکەیەوە دەیپۆشێ، کە لەسەریەوە تاپێیەکانی دادەگرێ. لەبەرئەوە پێویستە لەسەر گشت ئافرەتانی مسوڵمان ئەم ئایەتەی، کە باسکرا لەسەرخۆی پیادە بکاتو ملکەچی بێت.

(المفصل في احكام المرأة، ج٢).

## ئافرەت بۆی دروستە گوێی بسمێ

**پ٩/ ئایا ئافرەت بۆی جائیزە گوێی بسمێ؟**

وەڵام/ بەڵێ، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) کەوا پێغەمبەر ﷺ دوو رکات نوێژی جەژنی کرد، کە نە لەپێشترو، نە لە دواتر

نوێژی ئاوای نەکردوە، پاشان ئافرەتان هاتن‌و بیلال لەگەڵ پێغەمبەر بوو، جا فەرمانی پێکردن بە صەدەقەو خێرکردن، ئافرەتانیش دەستیان کرد بە لێکردنەوەی گوارەکانیان‌و هەڵیاندەدا، واتە: (هەڵیاندەدایە بەردەستی بیلال)، بوخاری بە صحیح- ی ڕیوایەتی کردووە).

ابن الحجر العسقلاني لە شەرحی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێ: ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر گوێ سمینی ئافرەت بۆ گوارەو شتی تر، ئەوەی، کە بۆیان دروستە خۆیانی پێ جوان بکەن.

ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) گوتویەتی: دروستە کچ بۆ جوانکردن گوێی بسمێ (واتە بۆ گوارە)، کە ئیمام ئەحمەدیش باسی کردووە. بەڵام بۆ کوڕ کەراهەتی هەیە، جیاوازیش لەنێوانیاندا ئەوەیە، کە ئافرەت پێویستی بەخشڵ‌و ئاڵتون هەیە، گوێ سمینیشی لەبەر بەرژەوەندی مافی کچە بە پێچەوانەی کوڕ.

## ئافرەتی مێردداربۆی دروستە قژی ڕەش کاتەوە

پ١٠/ ئایا ئافرەت بۆی جائیزە قژی بە ڕەنگی ڕەش بۆیە بکات.

وەڵام/ لەکتێبی(شرح العسقلانيلصحيح البخاري)دا هاتووە، کە هەندێ لە زانایان بۆچونیان وایە قژ بۆیەکردن بە ڕەنگی ڕەش بەڕەها (مطلق)ی جائیزە بەبێ جیاوازی نێوان پیاو ئافرەت. کۆمەڵێکیش (لە هاوەڵان) ڕێیان پێداوە وەك: (سعدی کوڕی ئەبی وەقاص، عوقبەی کوڕی عامر، حەسەنو حوسێن، جریر). (ابن القیم) ڕاوبۆچونی وایە، کە قژ بۆیەکردن بە ڕەنگی ڕەش دروستە،ئەگەرڕەنگە ڕەشەکە زۆر ڕەش نەبێت. واتە خۆی بەلای ڕەنگی سوور بنوێنێ، وەك لە (وەسمە) بەدیار دەکەوێ.

گەر بۆ چەواشەو فێڵ بێت لە دوژمن، بە تەنها ڕەنگی ڕەشی تۆخ بێت ئەوا جائیزە، خاوەنی کتێبی (المفصل في احکام المرأة) دەڵێ: ئەوەی

بـەڕای پەسـەندو ڕاسـت دەزانم، جـائیز بـونی بۆیەکردنی قژی ژنی مێـرددارە بـە ڕەنگی ڕەش، جا رەش کردنەوە کە، چ بۆ گۆڕینی ڕەنگی قـژی بێت، یان مەبەستی پێی، گۆڕینی سپییەتی مـوی قـژیو جوانی بێـت. چـونکە خـۆ جـوان کـردنو ڕازاندنـەوە بـۆ مێـرد، شـتێکی پەسـەندو باشـە. بۆیـەکردن بـۆ مێـرد، نابێتـە فێـڵو چەواشـەی مێـرد، چونکە مێـردی ژنەکـە دەیناسێو دەزانـێ تەمەنەکەی چەندە.

لـە کتێبـی (المغـني) ابـن قدامـة الحنبلـي دا هـاتووە. (کـە ئیسحاق) ڕێگـەی داوە بـە ژن، کـە قژی بۆ مێردەکـەی بـە ڕەنگی ڕەش بۆیـە بکـات. بەڵام بـۆ ئـافرەتی شـونەکردوو، جـائیز نیـە قـژی ڕەش بکاتەوە، یان هەر ڕەنگێکی تـر، ئەمـەش بـۆ ئەوەیە، تاوەکو دوور بێت لە چەواشەو فێڵکـردن بۆ داخوازیکەرەکەی. بە تایبەتی ئەو ئافرەتانەی، کە موی سپی لە قژیان دایە.

ئەم بۆیەیەی کە لە بازاڕەکانـدا هەیـە ئافرەتـان بەکاریـدێنن بـۆ قـژ بۆیـەکردن، ئەمـەیان جـائیز

نیە، چونکە ئەم بۆیە موەکان دادەپۆشیو نایەڵێ موەکان لەکاتی دەستنوێژ تەڕ ببن، یان خۆششتندا، کە ئەمەش مەبەستی خواستی دەستنوێژو غوسل نایەنێتە دی (بەڵام هەر بۆیەك قەتماغە لەسەر مووی قژ دروست نەکاتو وەك خەنە وابێ، ئەوا جائیزە).

(المفصل في احكام المرأة، د.عبدالكريم زيدان، الجزء الثالث).

## ئافرەت بۆی دروستە دەستو دەموچاوی بەدەرخات

پ١١/ خوای گەورە کە فەرمان بە ئافرەتە بڕوادارەکان دەکات لەئاست پیاوی بێگانەدا چاو داخەنو پاشان دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ (النور:٣١). تەفسیری ئەم ئایەتە چۆنە؟

وەڵام/ واتە: با ئافرەتان زینەو جوانیان بەدەر نەخەن، مەگەر ئەوەی، کە بەعادەت وایە

دەربکەوێ. (زمخشري) لە (الكشاف)دا لـە مانـای ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (زينة) ئەوەیـە، کـە ئـافرەت بە خشڵو کلو خەنـە، خۆی جـوان بکـات. جـا ئـەوەی، کــە بــەدیار دەکــەوێت بریتیــە لــە ئەنگوستیلەو کلو خەنە کە هیچی تیانیە، گـەر بۆ بێگانە بخرێتە ڕوو.

دیاریشـە کـە ئەنگوسـتیلە لەدەسـت دەکـرێو کلیش لەچاو دەدرێ. (ابن كثير) لە تەفسیری ئـەم ئایەتەدا دەڵێ: هیچ شتێك لە ڕازاوەیی (زينة) بۆ بێگانــە بەدەرمەخــەن، مەگــەر ئــەوەی، کــە ناتوانرێت بشاردرێتەوە.

ئیبن عەبباسیش مانای بەدەمو چاوو دەستەکان لێکداوەتـەوە، کـە ئەعمـەش لـە سـەعیدی کـوڕی حوبــەیری ڕیوایــەت کــردووە. ئیمـام ڕازی لــە تەفسیرەکەیدا واتای بەدەمو چاوو هەردوو دەسـت لێـك داوەتـەوە، هـەروەها ئـیبن العربـی المـالکی بەهەمان شێوە لێکی داوەتەوە.

قورطبـي لە تەفسیرەکەیدا دەڵـێ: خـوای گـەورە

فەرمانی کردووە بە ئافرەتان، کە زینەی خۆیان نیشانی خەڵکی نەدەن، پاشان ئەو زینەیەی، کە بەدەردەکەوێ، جیای کردۆتەوەو خەڵکیش لە ئەندازەی ئەو بەدەر کەوتنە جیاوازیان هەیە، ابن مەسعود دەڵێ: ڕواڵەت (ظاهر)ی زینەت بریتیە لە پۆشاك، ابن جوبەیری دەم‌و چاویشی زیاد کردووە. سەعیدی کوڕی جوبەیرو (عەتا)و (ئەوزاعی) دەڵێن: زینەت بریتیە لە دەم‌و چاوو هەردوو دەست‌و پۆشاك. ئیبن عەباس‌و قەتادەو مسوەری کوڕی مەخرەمە دەڵێن: ڕواڵەتی زینەت بریتیە لە کل (چاو ڕشتن)و بازنگ‌و خەنە، لەبەرئەوە ڕێگە پێدراوە ئافرەت ئەو زینەیە بەدەر بخات بۆ ئەو خەڵکانەی، کە دەچنە لای.

ئیمام (طەبەری) دەڵێت: ئەو زینەیەی، کە بەدەردەکەوێ بریتیە لە پۆشاك، گوتراویشە بریتیە لە ئەنگوستیلەو چاوڕشتن‌و دەم‌و چاوو هەردوو دەست، پاشان (طەبەری) دەڵێت: شایستەترین قسە دەربارەی ئەمە، کە ڕاست بێ ئەوەیە، کە دەڵێن: زینەت دەم‌وچاوو هەردوو

دەستە.

ئالوسی لە تەفسیرەکەیدا (روح المعاني)دا دەڵێت: واتە با زینەتی خۆیان بەدەر نەخەن لە خشڵو هاو وێنەی، مەگەر ئەوەی، کە بەدەردەکەوێ، بە واتـای: مەگـەر ئـەوەی کـە عـادەت وایـە بەدەردەکـەوێ، کـە ئەسـڵەکەی ئەنگوسـتیلەو چاوڕشتنو خەنەیە، کە لەدەست دەدرێت.

ئیمام ئەبوبەکر الجصاص لە کتێبەکەی (احکام القرآن)دا دەڵێت: لە ئیبن عەباسو موجاهیدو عەتا لە مانای ئەم ئایەتەدا ڕیوایەت کراوە، کە ئەم زینەیەی بەدەردەکەوێ (خەنەو چاو ڕشتن- کل-)ە.

خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێت: ئەو زینەیەی، کە بەدەرکەوێت بریتیە لە بازنو ئەنگوستیلە.

حەنەفیەکان دەڵێن: مەبەست لەو زینەیەی، کە جائیزە دەربکەوێ، بریتیە لە دەمو چاوو هەردوو دەست، چونکە چاوڕشتن جوانی دەمو چاوەو، ئەنگوستیلەش جوانی دەستە.

سەید قوطب لە (في ظلال القرآن)دا دەڵێ: ئەو زینەیەی کە بەدەردەکەوێت، دەم و چاوو هەردوو دەستە، کە جائیزە بەدیار بخرێت، چونکە بەدیار خستنی دەم وچاوو هەردوو دەست، رێگەپێدراو (مباح)ە. ئەوەش لەبەر ئەو فەرموودەیەی، کە پێغەمبەر ﷺ بە ئەسمای کچی ئەبوبەکری فەرمووو: **((يا اسماء ان المرأة اذا بلغت المحيض لم يصلح ان يرى فيها الا هذا وهذا، واشار الى وجه وكفيه))** (رواه ابوداود حديث حسن بمجموع طرقه)، واتە: ئەسماء گەر ئافرەت بالغ بوو، بێنوێژی بینی ئەوا بۆی دروست نیە هیچ شوێنێکی ببینرێ، مەگەر ئەمەو ئەمە نەبێت، پێغەمبەر ئاماژەی بۆ دەم و چاوو هەردوو دەستی کرد.

(المفصل في احكام المرأة، د.عبدالكريم زيدان).

## زێڕ بۆ ئافرەتان دروستەو جائیزە

پ ١٢/ مقۆمقۆیەك لە نێوان مسوڵمانان هەیە لەسەر حەرامی یان حەلاڵی زێڕ بۆ ئافرەتان، جا ئایا حوكمی ئەم مەسەلەیە چۆنە؟

وەڵام/ چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ هاتوون سەبارەت بە زێڕ بۆ ئافرەتان، كە حەرامیان بەدەر دەخات، بەڵام زانایان هەڵوێستی جیاجیان لەسەر هەیە:-

**فەرموودەكانیش ئەمانەن:**

١- عن اسماء بنت یزید. ان رسول الله ﷺ قال: **((ایما امراة. تقلدت قلادة من ذهب قلدت في عنقها مثلها من النار الیوم القیامة. وأي امرأة جعلت في اذنها خرصا "اي قرطا" من ذهب جعل في اذنها مثله یوم القیامة))** رواه ابو داود والنسائي.

٢- عن ابي هریرة (رضی الله عنه) ان رسول الله

**ﷺ قال : ((من احب ان يحلق حبيبه حلقة من نار، فليحلقه من ذهب، ومن احب ان يطوق حبيبه طوقا من نار فليطوق طوقا من ذهب، ومن احب ان يسور سواراً من نار، فليسوره بسوار من ذهب، ولكن عليكم بالفضة فالعبوا بها))** رواه ابوداود.

٣- حديث ثوبان ﷺ إن النبـي ﷺ: ((أنكر على فاطمة (رضي الله عنها) سلسلة من ذهب كانت تتحلى بها، فباعتها واشترت بثمنها عبدا فاعتقته.. فحدث بذلك النبي ﷺ فقال: الحمد لله الذي انجى"فاطمة من النار"))رواه النسائي.

**ڕای زانایان سەبارەت بەم فەرمودانە:**

**١- هەندێك لە زانایان لە سەنەدی ئەم فەرمودانە هۆیەكانی (ضعف)ی تێدا دەبینن‌و، حوكمی (ضعيف)ی بەسەردا دەدەن.**

**٢- هەندێك لە زانایان ئەم فەرمودانە بە(صحيح) دادەنێن، بەڵام دەڵێن لەكارخراون‌و نەسخ**

بوونەتەوە، چونکە بە چەند بەلگەیەکی تری فەرمودە، زێڕ بۆ ئافرەتان ڕێگە دراوە، کە بەیهەقیو غەیری ئەویش ئیجماعیان لەسەر ئەمە نەقڵ کردووەو، فیقھ و کارپێکردنی لەسەر جێگیر بووە.

**فەرمودەکانیش ئەمانەن:**

- اخرج الامام الترمذي في (جامعة) عن أبي موسى الأشعري ان رسول الله ﷺ قال: **((حُرّمَ لباس الحرير والذهب على ذكور امتي، وأحلّ لإناثهم))** جامع الترمذي ج٥، ص٢٨٣، واتە: ئاوریشم (حریر)و زێر لەسەر نێرینەی ئوممەتم حەرامە، بۆ مێیینەی ئوممەتم حەلاڵە.
- اخرج ابو داود عن علي (رضي الله عنه) ان نبي الله ﷺ اخذ حريرا فجعله في يمينه، واخذ ذهبا فجعله في شماله ثم قال: **(( هذين حرام على ذكور امتي))** سنن ابو داود، ج١١، ص١٠٧، واتە: ئیمام عەلی دەڵێ: پێغەمبەری

خوا ﷺ پۆشاکی حەریری لەسەر دەستی ڕاستی داناو، زێریش لەسەر دەستی چەپی، فەرموی ئەم دوانە (زێڕو ئاوریشم) حەڕامن لەسەر نێرینەی ئوممەتم.

★ عن علي بن ابي طالب (رضي الله عنه) اخذ رسول الله ﷺ حريرا في شماله وذهبا بيمينه، ثم رفع بهما يديه وقال: **(( ان هذين حرام على ذكور امتي حل لاناثهم))** رواه ابن ماجه (سنن لابن ماجه، ج۲، ص۱۱۸۹)، واتە: پێغەمبەری خوا پۆشاکی ئاوریشم بەدەستی چەپیەوە بوو، زێریش بەدەستی ڕاستیەوە، پاشان بە هەردوو دەستی، بەرزی کردنەوەو فەرموی: (ئەم دوانە حەڕامن لەسەر "نێرینە"ی ئوممەتمو حەلاڵن بۆ مێیینە "ئافرەتان")یان.

۳- هەندێك لە زانایان سەبارەت بەو فەرمودانەی، کە حەڕامی زێڕ دەردەخەن، دەڵێن: ئەم فەرمودانە تایبەتن بەو ئافرەتانەی، کە زەکاتی لێنادەن، لەنێو مەزهەبەکانیشدا

هـەبوونی جیـاوازی، لەسـەر زەكـاتی زێـڕی ئافرەت، كارێكی ناسراو (معروف)ە.
سەرەڕای ئەم ڕایانە كۆڕای زانایان ( الاجماع) لەسەر ئەوەیە، كە زێڕ بۆ ئافرەتان حەڵاڵە.
٤- هەنـدێك لـە زانایـان دەڵـێن: هەڕەشـەی ئـەم فەرمودانـە بەرانبـەر بـەو ئافرەتانەیـە، كـە خۆیـانی بـۆ پیـاوی بێگانـە پـێ دەڕازێننـەوەو بەدیاری دەخەن. نەسائی باسی هەندێك لـەو فەرمودانـەی كـردووە لـەژێر ناونیشانی (بـاب الكراهيـة للنسـاء في اظهـار حلـي الـذهب).
هەنـــدێك لـــەو زانایانـــە گوتویانـــە: ئـــەو فەرموودانەی دەربارەی نكۆڵیو ئینكاری زێـڕ هاتووە، ئەمـە بـۆ ئـەو ئافرەتانەیـە كـە زێـڕی زۆریان هەیە كە جێی گومان نیـە بـۆ فـەخرو شانازیو ناوو شۆرەتە.
(الصحوة الاسلامية بين الجحود والتطرف، ل١٦٤، د.يوسف القرضاوي).

# ئافرەتی سك پڕ
# قەزاكردنەوەی ڕۆژویی لەسەر نیە

پ١٣/ ئافرەتێكی سك پڕ یان شیردەر گەر لەخۆی بترسێ، یان لە منداڵەكەی، كە بەهۆی ڕۆژوو گرتنەوە تووشی زیان دەبن، ڕۆژوو نەگرێ، ئایا قەزاكردنەوەی لەسەرە؟

وەڵام/ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إن الله وضع عن المسافر الصَوم وشَطرَ الصَلاة، وعَنِ الحَبلى والرّضع الصوم)) رواه ابوداود والترمذي وابن ماجه وسنده جيد، واتە: خوای گەورە ڕۆژوگرتن‌و نیوەی نوێژی لەسەر سەفەركەر هەڵگرتووە، هەروەها ڕۆژووگرتنی لەسەر ئافرەتی سك پڕو شیردەر هەڵگرتووە.

ئایەتی قورئانیش سەبارەت بە واجبیەتی قەزاكردنەوەی ڕۆژوو لەسەر نەخۆش‌و سەفەر كەر چەسپاوە. بەڵام قەزاكردنەوەی لەسەر سك پڕو شیردەر واجب نەكردووە.

بەبۆچونی (ابن عمر وابن عباس) گەر ئافرەتی

سك پڕ بەڕۆژوو ببێ، بەهۆی ڕۆژووەکەیەوە زیان بەخۆی، یان بە منداڵەکەی بگات، ئەوا پێویستە بەڕۆژوو نەبێتو فیدیە بدات، کە تێرکردنی یەك فەقیرە بۆ هەر ڕۆژێکو، قەزاکردنەوەی لەسەرنیە.

بەڵام ئەو ئافرەتانەی لەبەر بێنوێژی (حیض) بەرۆژوو نەبوون، ئەوا تەنها قەزا کردنەوەیان لەسەرەو فیدیە نادەن. وەك کە خاتوو عائیشە فەرمویەتی: ((کنا نحیض علی عهد رسول الله ﷺ فنؤمر بقضاء الصوم ولا نؤمر بقضاء الصلاة)) رواه البخاري ومسلم، فقه السنة، م١، ص٤٤٠، سید سابق.

## بۆ زەرورەت و ئیش وکاری زۆر، دروستە نوێژ جەمع بكرێ

**پ ١٤/ بە حوكمی ئەوەی كە ئافرەتی شیردەرو چێشت لێنەر زەحمەتێكی زۆری دەكەوێتە سەر بۆ نوێژەكان، ئایا بۆ هەر یەكێك لەوانە جائیزە نوێژەكان بە (جمع) بكەن؟**

وەلام/ شەرعی خوا ڕەچاوی بەرژەوەندییەكانی گشت لایەكی كردووەو زەحمەتی هەلگرتووە، كە ببێتە زیانگەیاندن، ئیبن عەبباس گوتوویەتی: ((جمع رسول الله ﷺ بين الظهر والعصر، والمغرب والعشاء بالمدينة في غير خوف ولا مطر)) رواه مسلم، واتە پێغەمبەری خوا نوێژی نیوەڕۆو عەسر، مەغریب و عیشای پێكەوە جەمع كردووە لە شاری مەدینەدا، بێ هەبوونی ترس و باران بارین.

لە ئیبن عەبباسیان پرسی: بۆچی پێغەمبەر ئاوای كردووە؟ وتی: ویستی ئوممەتەكەی توشی زەحمەت و ناخۆشی نەكات.

هاو مەزهەبانی حەنبەلی، جەمع کردنی نوێژەکانیان بە جائیز داناوە بۆ ئەو ئافرەتە شیردەرانەی، کە لایان زەحمەتو ناخۆشیە بۆ هەر نوێژێك پۆشاکەکەیان بشۆن، هەروەها بۆ ئەو ئافرەتانەش، کە خوێنەچرکە (استحاضة)یان هەیەو ئەوانەیش، کە دوچاری میزەچڕکە (سلسل البول) بوون.

ئیبن تەیمیە گوتویەتی: فراوانترین مەزهەب سەبارەت بە جەمعکردنی نوێژەکان، مەزهەبی ئیمام ئەحمەدە، کەوا بە جائیزی داناوە بۆ هەبوونی ئیش‌و کار، نوێژ جەمع بکرێت وەك، کە نەسائی ریوایەتی کردووە بە مەرفوعی بۆ پێغەمبەر ﷺ تا ئەوەی، کە فەرموویەتی: ((یجوز الجمع ایضا للطباخ والخباز ونحوهما ممن یخشی فساد ماله))، واتە: هەروەها بۆ چێشتلێنەرو نانکەرو ئەوانەش، کە لە تیاچونی ماڵەکەیان دەترسن، بۆیان جائیزە نوێژەکانیان جەمع بکەن.

(فقة السنة، المجلد الاول، سید سابق، ص٢٩٢).

## مەنعی تەبیعی جائیزە

پ ١٥/ مەسـەلەیەك هەیـە ڕەنگـە لـەنێو مسـوڵمانان بـە ڕوونـی نەیەتـە بەرچـاوو نادیـار بێـت، کـە پرسـیاری زۆریشـی دەربـارەی کـراوەو دەکرێـت، ئـەویش (العـزل)ە، کە بە زاراوەی ئێستا واتـە (منـع الطبیعـي)، ئایـا حوکمەکـەی لـە ئیسـلام چیە؟

وەڵام/ لـە سـەردەمی پێغەمبـەر ﷺ ئـەم کـارە هەبووەو یارانی پێغەمبەر لـە سـەردەمی ئـەودا (عـزل)یـان کـردووەو (وحـي)یـش دابـەزیووەو قەدەغە نەکراوە. وەك لە صەحیحی بوخـاریو موسـلم دا هـاتووە لـە جـابرەوە، کـە وتوویـەتی: ((کنا نعزل عهد الرسول ﷺ والقـرآن ینـزل))، واتـە: لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا (عـزل)مـان دەکـرد (واتـە: مـەنعی تـەبیعی)و ئایـەتی قورئـانیش دادەبـەزی، هـەروەها لـە صـەحیحی موسـلیمدا هـاتووە کـە وتوویـەتی: ((کنـا نعـزل

على عهد رسول الله فبلغ ذلك رسول الله ﷺ فلم ينهنا)، واتە: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا ئێمە (عزل)مان دەکرد، جا ئەمە بە پێغەمبەر گەیشتو قەدەغەی نەکردین.

لە کۆڕی ئیمامی عومەردا باسی (عزل) کرا، پیاوێك وتی: دەڵێن ئەم کارە (عزل) زیندەبەچاڵی بچووکە (الموؤدة الصغرى)، ئیمام عەلی گوتی: ئەمە نابێتە زیندەبەچاڵی بچووك، تاوەکو بەحەوت قۆناغ تێپەڕ نەبێت، تادەبێتە کەمە قوڕێك، پاشان دەبێتە (نطفة)یەك، پاشان دەبێتە (علقة)، پاشان دەبێتە (مضغة)، پاشان دەبێتە ئێسقان، پاشان گۆشت دایدەپۆشێ، ئنجا دەبێتە دروستکراوێکی تەواو. ئیمام عومەر گوتی: ڕاستت فەرموو خوا تەمەنت درێژ بکات.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مەنعی تەبیعی شتێکی دروستە، بەڵام بەمەرجی ڕازیبوونی ژن (هاوسەر) وەك، کە ئیمام ئەحمەدو غەیری ئەویش بڕیاریان لەسەرداوە. چونکە ژنیش مافی

هەیە لە منداڵ بوونو چێژ وەرگرتن. ئیمام عومەریش قەدەغەی (عەزل)ی کردووە، گەر بەبێ ئیزنی ژن بێت.

(الحلال والحرام في الاسلام- د.یوسف القرضاوي، ص١٨٤-١٨٥-١٨٧).

## ژن بۆی جائیزە زەکاتەکەی بداتە مێردەکەی، گەر هەژار بوو

**پ ١٦/ گەر ژن پارەی هەبوو، پارەکەشی گەیشتە ڕاددەی زەکاتدان، ئایا بۆی جائیزە بە مێردی فەقیری بدات ؟**

وەڵام/ ڕای ڕاستو پەسەند ئەوەیە، کە جائیزە ژن زەکاتەکەی بدات بە مێردی هەژاری، هیچ بەڵگەیەکیش نیە، ئەمە قەدەغە بکات. بەڵکو بەڵگەی شەرعی بە دروستی دادەنێت، ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەمە، کە ئیمام بوخاری تەخریجی کردووە، ((إن زینب قالت لزوجها عبدالله بن مسعود سَل رسول الله ﷺ أیجزي عني أن انفق علیك وعلی ایتام في

حجري من الصدقة؟ فقال لزوجته: سلي انت رسول الله ﷺ فانطلقت الى النبي فوجدت إمرأة من الأنصار على الباب وحاجتها مثل حاجتي، فمر علينا بلال فقلنا: سَلِ النبي ﷺ: أيجزي عني أن أنفق على زوجي، وايتام لي في حجري؟ وقلنا: لا تخبرنا، فدخل فسأله فقال: ((من هما؟ قال: زينب، قال: أي الزيانب؟ قال: إمرأة عبدالله، قال ﷺ: نعم، ولها أجران، أجر القرابة، وأجر الصدقة))". واته: زەینەب بە عبدالله كوڕی مەسعودی مێردی گوت: لە پێغەمبەری خوا پرسیار بكە، ئایا جائیزە زەكاتەكەی خۆم بدەم بە تۆو، ئەو منالە بێباوكانەی لەلامن؟ عبدالله بە خێزانەكەی وت: تۆ پرسیار لە پێغەمبەری خوا بكە: زەینەب دەڵێ: چوم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بینیم ئافرەتێكی ئەنصاری لەبەر دەرگا وەستاوە، ئەویش هەمان پرسیاری هەبوو، جا بیلال بەلاماندا تێپەڕی و ئێمەش وتمان: پرسیار لە پێغەمبەر بكە: ئایا بۆ من جائیزە زەكاتەكەم بدەم بە مێردەكەم و منداڵی

بێباوکم هەن، کە لەلامن؟ ئەویش پرسیاری لێکردو فەرمووی: ئەو دوو کەسە کێن، کە پرسیاریان کردووە، ئەویش وتی: زەینەب، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: کام زەینەب؟ وتی: ژنی عبدالله، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵێ، جائیزەو دوو پاداشتی بۆ هەیە، پاداشتی نزیکیو خزمایەتی، پاداشاتی زەکات دانەکە.

## تەیەممومم بە چ خۆڵێك دەکرێت؟

پ ١٧/ بۆ زێدە شارەزایی لەبارەی تەیەممومم، واپێویست دەکات بزانین تەیەممومم بە چ خۆڵێك دەکرێت؟

وەڵام: تەیەممومم بەخۆڵێکی پاكو هەرشتێك، کە لە ڕەگەزی زەویدا بێت دەکرێت، وەك لمو بەردو گەچ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ (النساء -٤٣).

گشت زمانەوانان لەسەر ئەوەن، کە واتای

(صـعيد) سـەر رووى زەوييـە، جـا خـۆڵ بێـت، ياغەيرى ئەوە (فقه السنة، ص٧٩).

جمهـورى فوقـەها بەمـەرجيان دانـاوە، كـە خۆڵەكـە دەبـێ لەسـەر زەوى بێـت، بـەڵام ئيمـام ئەحمەد بەمـەرجى دانـەناوە، چونكە بـەلاى ئـەو گرنگ ئەوەيە خۆڵ بێت، جا لەسەر هەرشـوێنێك بێت. لەبەرئەوە بەلاى ئەو جائيزە بۆ تەيەمموم، دەست بدرێت بدرێت لە پۆشاك، يـان كـراس، يـان لە چەند مويێك كەوا تۆزى پێوە بێت.

ئيبن قودامە گوتويەتى: ئەگەر يەكێك دەست بدات لەسەر بەردێك يان ديوارێك، يـان ئاژەڵێك، يان هەرشتێك، كـە بـەو دەستلێدانە خـۆڵى پێـوە بنوسـێت، بـۆى جـائيزە تەيـەممومى پـێ بكـات. بەڵام گەر خۆڵى پێوە نەبێت، ئـەوا جـائيز نييـە. مـەزهـەبى زەيدييـەكانيش وەك مـەزهـەبى حەنبەلييەكانە.

(المفصل في احكام المرأة، د. عبدالكريم زيدان، الجزء الأول، ١٩٩٣، ص١٢٤).

# ئافرەت لەکاتی مەترسی بۆ سەرشەرەف و ناموسی دەتوانێ تەمەمموم بکات، با ئاویش هەبێت

**پ١٨/ گەر ئافرەتێکی مسوڵمان پێویستی بەئاو بوو بۆ دەستنوێژ، ئاویش لەلای کۆمەڵە پیاوێکی فاسق هەبوو، ئایا ئەو ئافرەتە بۆی جائیزە بچێتە لایان دەستنوێژ هەڵگرێ. یان نەچێتە لایان و تەیەممو‌م بکات؟**

وەڵام: ئافرەت لەسەری نیە هەوڵی پەیداکردنی ئاو بدات، گەر ئەم ئاو پەیداکردنە ببێتە هۆی دەستدرێژی کردنە سەری، ئا لەو حاڵەتەدا ئەم حوکمە دەبێتە حوکمی نەبوونی ئاو، لەبەرئەوە پێویستە ئافرەتەکە تەیەممو‌م بکات.

ئیمام ئیبن قدامەی حەنبەلی وتویەتی: (گەر لەناو کۆمەڵێکی فاسق ئاو دەست دەکەوت، ئافرەتیش لەخۆی دەترسا بەچونە لایان تووشی دەستدرێژی کردنە سەر ببێت، ئەوە وەك ئەوە

وایە، کە ئاوی دەست نەکەوێت. ئیبن موساش وتویەتی: ئافرەتەکە تەیەمموم دەکاتو لەسەری نیە نوێژەکە دوبارە بکاتەوە، بەڵکو نابێ هەوڵ بدات بچێتە لای ئاوەکە، چونکە دەستدرێژی زیناکردنی تێدایەو هەتککردنی خودو شەرەفی تێدایە، لەوانەیە سەر بکێشێ بۆ کوشتنی.

(المفصل في احكام المرأة، الجزء الأول).

**چۆنیەتی (تەیمموم)یش بەم شێوەیە:**

لە دڵدا نیەتت هەبێت، کە لەبری دەستنوێژ تەیەمموم دەکەی ، پاشان دەڵێی (بسم الله الرحمن الرحیم)، ئینجا هەردوو دەستت دەدەی لە خۆڵو فوی پیادە دەکەیو مەسحی دەموچاو دەکەیتو مەسحی دەستەکانت دەکەیت، تا بازنەی دەست (مەچەك)، واتە بۆ مەسحی دەموچاوو هەردوو دەست یەك (ضربة) بەکاردێنی، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای کردووە. کاتێك عەممار تووشی جەنابەت دەبێتو ئاوی دەست ناکەوێت، ئەویش خۆی

بەناو خۆڵدا کردبوو، پاشان نوێژی کردبوو جا ئەمەی بە پێغەمبەر گوت، کە ئاواهی کردووە، بەڵام پێغەمبەر پێی فەرموو: ((انما يكفيك هكذا، وضرب النبي ﷺ بكفيه الأرض وتنفخ فيهما، ثم مسح بها وجهه وكفيه)) رواه الشيخان.

(المفصل في احكام المرأة، الجزء الاول).

## ئافرەتی حەیزدارو زەیستان، کە پاك بونەوە، بە هۆی عوزرێکەوە دەتوانن تەیەممومم بکەن

پ ١٩/ گەر ئافرەتی حەیزدارو زەیستان لە خوێن پاکبوونەوە، بەڵام ئاویان دەست نەکەوت خۆیان بشۆن، یان ئاو هەبوو، بەڵام لەبەر نەخۆشی یان توندیی نەخۆشی، یان قوڵیی برین، یان زۆر سەرمایی، یان لە ماڵیَ نەبوون و لە ماڵێکی تربوون دەترسان لەوەی قسەیان بۆ هەڵبەستن، یان گومانی خراپیان پێ ببەن و نەیاندەتوانی خۆیان بشۆن، ئایا جائیزە

تەیەمموم بکەن؟

وەڵام/ ئافرەتی حەیزدار، یان زەیسان، گەر ئاوی دەست نەکەوت بۆی جائیزە تەیەمموم بکات، کاتێکیش، کە ئاوی دەستکەوت، با خۆی بشوات و نوێژەکانیشی دووبارە نەکاتەوە. ئیبن تەیمیە وتویەتی: (ئافرەت کە لەحەیز پاك بۆوە گەر توانی خۆی بشوات، باخۆی بشوات ئەگینا با تەیەمموم بکات و نوێژەکەی بکات).

(المفصل في احكام المرأة، الجزء الاول)

هەروەها ئافرەتی حەیز دارو زەیستان، لەبەر ئەو هۆیانەی تر، کە لەسەرەوە باسکراون، بۆیان جائیزە تەیەمموم بکەن، بە بەڵگەی ئەم دوو فەرمودەی خوارەوە:

١- جابر دەڵێ: بۆ سەفەرێك دەرچوین، پیاوێك لە ئێمە بەردێکی بەر سەری کەوت و بریندار بوو، پاشان لەخەودا تووشی جەنابەت بوو. پیاوەکە بە هاوڕێکانی گوت: ئایا ڕێگە پێدانێك هەیە تەیەمموم بکەم؟ ئەوانیش

وتیان نەخێر، مادام دەتوانی ناو بەکاربهێنی، ئێمە هیچ ڕێگە پێدانێك شك نابەین، پیاوەکە خۆی شوشتو بەهۆیەوە مرد. جابر دەڵێ: کاتێك چوینەوە لای پێغەمبەری خودا ئەم هەواڵەی پێدرا، فەرموی: ((قتلوه، قاتلهم الله، الا سألوا اذا لم يعلموا؟ فانما شفاء العي السؤال. انما يكفيه أن يتيمم ويعصر ويعصب على جرحه خرقة ثم يمسح عليه، ويغسل سائر جسده)) رواه ابو داود وابن ماجه والدار قطني وصححه ابن السكن، واتە: کوشتیان خوا بیانکوژێ، ئەبو کە نازانن پرسیاریان بکردایە؟ شیفای نەزانین پرسیارکردنە. ئەوەندەی بەس بوو، کە تەیەمموم بکاتو برینەکەی بە قوماشێك ببەستایەو پاشان مەسحی لەسەر بکردایەو گشت لەشی بشوشتایە.

٢- کاتێك عەمری کوڕی عاص، ناردرا بۆ غەزوەی (سلاسل)، عەمر دەڵێ: لە شوێنێکی زۆر سارددا توشی جەنابەت بوم، لەوە دەترسام، کە خۆم بشۆم، توشی زیانو هەلاکەت ببم،

پاشان نوێژی بەیانیم بۆ هاوڕێکانم کرد.
کاتێک چوینەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیان بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی: ((عەمر! تۆ لەشت پیس بووەو نوێژیشت بۆ هاوڕێکانت کردووە؟
دەڵێ وتم: فەرمایشتی خوای گەورەم هاتەوە یاد ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ... **خۆتان مەکوژن، خوا بۆ ئێوە بە بەزەییە**﴾ (النساء- ٢٩) منیش تەیەممومم کردو پاشان نوێژم کرد.
دەڵێ: پێغەمبەر خوا ﷺ پێکەنیو هیچ شتێکی نەگوت))، ئیمام ئەحمەدو ئەبو داودو حاکمو دار القطني وئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردووەو بوخاری بە موعەلەقی داناوەو ئەمەش ئیقرارە، ئیقراریش بە بەڵگە دادەدنرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەسەر شتێکی ناهەقو باتڵ ئیقرار ناکات.

(فقه السنة، سيد سابق، المجلد الاول، ص٧٨).

## ئافرەتی ناشیزە چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکرێت

**پ ٢٠/ زۆر ئافرەت لەبەر نەشارەزایی لە دینەکەی یان لەبەر خۆبە زل زانینی تووشی یاخی بوون (نشوز) دەبێت، ئایا ئیسلام چارەسەری بۆ ئەم کێشەیە چیە؟**

**وەڵام/ سەرەتا پێویستە بزانین (نشوز الزوجة) چیە: نشوز بریتیە لەسەر پێچی کردنی ژن بۆ مێردەکەی‌و گوێڕایەڵی نەکردنی، یان بریتیە لەخۆ بەدەستەوە نەدانی ژن بۆ سەرجێیی کردن لەگەڵ مێردەکەی، جا هەر ئافرەتێك یەکێك لەم حاڵەتانەی تیا بەدی دەکرا، ئەوە بەو ئافرەتە دەگوترێت (ناشزة)، واتە: دەرچوو لە گوێڕایەڵی مێردەکەی لە چاکەدا، خوای گەورە چارەسەری ئەم کێشەی کردووەو دەفەرمووێ:** ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا﴾

(النساء- ٣٤)، واتە: ئەو ئافرەتانەی کە توشی سەرپێچی دەبن، ئامۆژگاریان بکەن، ئامۆگاریەکەیەش بریتیە لە بەبیر هێنانەوەی ئافرەت بە فەرمانەکانی خوای گەورە، کە فەرمانی کردووە ئافرەت پێویستە لەژێر فەرمانبەری پیاودا بێت لەچاکەداو، مافەکانی پیاو لەسەر ژن چیە جێبەجێیان بکات، هەروەها ترساندنی ژنەکە بەعەزابو سزای خوای گەورە، گەر ئەم سەرپێچییە بکات، ئەوا خوای گەورە سزای دەداتو دەکەوێتە بەر خەشمی پەروەردەگارو تاوانبار دەبێت. ئەوەشی بخرێتە بەرچاو، کە بە ئەنجامدانی ئەم کارە، ئەوا لە مافەکانی نەفەقەدانو پۆشتەکردنیدا بێبەشی دەکات.

گەر ئامۆژگاریی بێهودە بووو گوێی پێنەدا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱهۡجُرُوهُنَّ﴾، واتە: سەرجێیان لەگەڵدا مەکەنو لێیان نزیک مەبنەوەو، قسەیان لەگەڵ مەکەن، بەلام قسە نەکردن لە سێ ڕۆژ زیاتر جائیز نیە، وەك ئەبو

هـورەیرە (رضـي الله عنــە) گێڕاویەتیـەوە کـە، پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: **((لایحـل لمسـلم ان یهجر اخاه فوق ثلاثة ایام)).**

(ئیبن عـەبباس وتویەتی: (الهجـر) ئەوەیـە: کـە لەگـەڵ ژنەکـەدا جیمـاع نەکـەی، بـەڵام پێویسـتە لەگەڵیدا بخەوی‌و پشتی تێبکەی).

ئەگەر ئەمەش سوودی نەبوو سوور بوو لەسەر سەرپێچـیکردن، خــوای گــەورە دەرفــەرموێ: ﴿وَٱضۡرِبُوهُنَّ﴾ لێیان بـدەن، بـەڵام چۆن لێدانێك؟ لێــدانێك بــێ، وەك کــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ فـەرمانی کـردووە، لێـدانێکی سـووك بێـت‌و زۆر تونـد نـەبێ، کـە شـوێنێکی بشکێنرێ‌و، نابـێ لـە دەم‌و چاوو شوێنە حەساسەکانی بـدرێت، چونکە مەبەسـت لێـرەدا تـەمبێ کـردن (تأدیـب)ە، نـەك تۆڵەسەندن. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن لکم علیهن الا یوطئن فرشکم أحدا تکرهونه فإن فعلن فاضـربوهن ضـرباً غـیر مـبرح))، واتــە: مافتــان بەسەر ژنەکانتانەوە ئەوەیە، کە نـەهێڵن کەسێك

بێتە ماڵتانەوە، کە خۆتان پێتان خۆش نیە... جا ئەگەر ئەوان سەرپێچیان کرد، ئەوا لێیان بدەن بە لێدانێکی سوك.

روى ابو داود عن حكيم بن معاوية القستيري عن أبيه قال: قلت يارسول الله ﷺ ما حق زوجة احدنا عليه؟ قال: (( ان تطعمها اذا اطعمت، وتكسوها اذا اكتسيت، ولا تضرب الوجه ولا تقبح، ولاتهجر الا في البيت))، اخرجه احمد في المسند واخرجه ابن ماجة في السنن.

(فقه السنة، المجلد الثاني، سيد سابق، الطبعة الرابعة).

## لە شوێنە فێنكو ساردەكان، نابێ كچ خەتەنە بكرێت

پ ٢١/ دەمێكەو ئەمڕۆش زۆرناژەنانی مافی ئافرەتان تۆمەتێكی نابەجێ دەخەنە پاڵ ئایینی پیرۆزی ئیسلام كە گوایە ستەمی لە ئافرەت كردووە بەوەی، كە ئەمری داوە بە خەتەنەكردنیان، ئایا حوكمی خەتەنەی ئافرەتان چییە؟

وەڵام/ لەناو كۆمەڵگەی كوردی تائێستاش ئەم كارە دەكرێتو تۆمەتەكەشی دەدەنە پاڵ ئیسلام، كە ناحەزان كردوویانە بە بنێشتە خۆشەی خۆیان، بێئەوەی هیچ زانیارییەكی تەواویان لە ئیسلامدا هەبێو بێ لێكۆڵینەوە، كە ئایا ئەم كارە بۆ هەموو ناوچەیەك یەك حوكمی هەیە، یان نا؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **((الختان سنة للرجال، مكرمة للنساء))** رواه الطبراني وفي اسناده من لا يحتج به، واتە: خەتەنەكردن بۆ پیاوان

سوننەتەو بۆ ئافرەتانیش ڕێزدانە.

جا ئەگەر ئەم كارەش ئەنجام درا، پێویستە لە چ ناوچەیەك بكرێ؟ مامۆستا محمود مەهدی الاستانبولی لە كتێبەكەیدا (تحفة العروس) كە بۆ پێنجەمین جار لەچاپ دراوەتەوە دەڵێ: (خەتەنەكردنی ئافرەتان لە وڵاتە فێنك (معتدل)و وڵاتە ساردەكان بەرەهایی (مطلق) قەدەغەیەو نابێ بكرێت، بەڵام لە وڵاتە گەرمەكاندا شەرعیو پێویستە.

جا كوردستانیش لەو ناوچە فێنكو ساردانەیە نابێ كچ خەتەنە بكرێت، چونكە میتكە (بظر) لە قەبارەی خۆی زیاتر گەورە نابێت، گەر ئافرەت لە ناوچەی فێنك وەك كوردستان خەتەنە كرا، تووشی ساردی جنسی (البرودة الجنسیة) دەبێت، كە زۆربەش تووش بوونو لە چێژی جنسی بێبەش بوون. ئەمەش قسەی پزیشكانی كوردستانە.

بۆیە لە وڵاتە گەرمەكان پێویستە خەتەنەی

ئـــافرەت بكـــرێ، چـــونكە گـــەرمی دەبێتـــە گەشـــەكردنو گـەورەبوونی میتكـە (بظـر)، كـە ڕەنگـە درێـژی بگاتـە (٥)سـم، بەمـەش جنسـی ئافرەت دەوروژێنـیو زیـاد لـە پێویسـت بـەهێزی دەكـــات، كـــە دەبێتـــە هـــۆی لـــەڕێ لادانو ئینحرافكردنی.

هـەر بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ بـە ئـوم عـەطیـەی فەرمو، كە ئافرەتێك بوو لە مەدینە خەتەنەی ئـافرەتی دەكـرد، كـە لـە خەتەنەكردنـدا زۆری لێنەبڕێ: ((**لا تنهكيه!! فإن ذلك احظى للمرأة، واحـب للبعـل**... زۆری مـەبڕە، چـونكە ئەمـە بەشەزۆری چێژی ژنەو، مێردیش پێی خۆشـە)) رواه ابوداود وسنده صحيح.

هـەروەها لـە ڕیوایـەتێكی تـردا كـە (رزیـن) هێناویـەتیو سەندەكەی (صحيح)ە كە بـە ئـوم عـەطیـەی فـەرمووە كـەمێكی لـێببڕێو لـە بنەڕەگەوە نەیبڕێ: ((**اشمي ولاتنهكي! فإنـه انور للوجه! واحظى عند الرجل**)). بەڵگە نەویستە،

کە زۆر بـڕین، ئافرەت دوچاری ساردی جینسی دەکـات، کـە کێشـە لـەنێوان ژنو مێـرد دروسـت دەکاتو هاوسەنگی جنسیان تێك دەدات.

ئیبن تەیمیە فەرموویەتی: گەر زیادەڕۆیی کرا لە بڕینی میتکە، ئەوا ئارەزوی جنسی کزو بێهێز دەکاتو، مەبەستی پیاو ناهێنێتە دی، بەڵام گەر میتکـە گـەورە نـەدەبوو و، کـورت بـوو، یـان مامناوەندی بوو، ئەوکاتـە نابـێ خەتەنـە بکرێ.
(تحفة العروس، الطبعة الرابعة، ص٤٣٦).

## پێویستە ئافرەت لەژێر پۆشاکەکەی پانتۆڵ لەبەر بکات

**پ٢٢/ ئایـا پێویسـتە ئـافرەتی مسـولْمان پانتۆڵو بێجامە لەژێر پۆشاکەکەی لەبەر بکات؟**

وەڵام/ ئـافرەتی مسـولْمان پێویسـتە هۆشـیارو دووربین بێتو، ڕودانی هەموو شتێکی لەناکاو لەبەرچاو بگرێت، کە تووشی ببێـت، زۆرجار

وادەبێت ئافرەت لە ڕێگادا تووشی هەڵخلیسکان، یان ڕووداوێك دەبێتو دەکەوێت، کە پێویست بە هەڵگرتنی دەکات، لەوکاتەشدا پێویست بەدیارنەکەوتنی جەستەی دەکات، لەبەرئەوە پانتۆڵو بێجامە لەبەرکردن لەژێر پۆشاك بۆ ئافرەتی مسوڵمان، بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەی ئێستا، زۆر زەرورەو پێویستە.

ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لێخۆشبوون بۆ ئافرەتە بێجامە لەبەرەکان دەکاتو، فەرمانیش دەکات بە ئافرەتان بە بێجامە لەبەرکردن لە کاتی چونە دەرەوەیاندا: عن علي (رضي الله عنه) قال: كنت قاعدا عند رسول الله ﷺ عند البقيع في يوم مطير، فمرت إمراة على حمار فهوت يد الحمار فسقطت المرأة فأعرض عنها النبي ﷺ بوجهه فقالوا: يا رسول الله انها متسرولة، فقال: **((اللهم إغفر للمتسرولات من امتي، يا أيها الناس إتخذوا السراويلات فإنها من استر ثيابكم، وحصنوا بها نساءكم اذا خرجن))**.(اخرجه ابن عدي في -الكامل- والعقيلي،

والبـزار والبيهقـي في -الادب- مطـولا. نقـلا مـن كتاب اللباس والزينة في الشريعة الاسلامية، د.محمد عبدالعزيز، المفصل في احكام المـرأة، د.عبـدالكريـم زيدان)، واتە: ئیمام عەلی (رضـي الله عنـه) گوتی: لەلای پێغەمبەری خوا دانیشتبووم لە (بقيع)، لـە ڕۆژێکی باراناویدا، ئافرەتێك لەسـەر گوێدرێژکدا کەوتە ناو کەندێکی ئاوەوە، جا ئافرەتەکە کەوتـە خـــوارەوە، پێغەمبـــەریش ﷺ ڕووی وەرگێـــڕا، ئەوانــەی لـەوێ بـوون گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئـەم ئافرەتـە لـەژێرەوە پـانتۆڵی لەبـەرە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((خوایـە لـە گونـاهی ئـەو ئافرەتانــەی ئوممـەتم خـۆش بـە، کـە پانتۆڵیـان لەژێرەوە لەبەرە، ئەی خەڵکینە پانتۆڵ لـەژێرەوە بپۆشـن، چـونکە داپۆشـەرترین پۆشـاکتانە، بـا ئافرەتـەکانتان گـەر لەماڵـەوە چـونە دەرەوە لەبەری بکەن)).

جـا هـەر ئـافرەتێکی مسـوڵمان دەیـەوێ وەبـەر دوعاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکـەوێ، بـا لـەژێر جلەکەیەوە پانتۆڵ لەبەر بکات.

دیارە (سروال) مانای پانتۆڵ، دەرپێ، شەرواڵ، پاپۆش، دامانپۆش دەبەخشێت.

## با دوای نان خواردن نوێژ بکرێت

پ٢٣/ زۆر لە ئافرەتان یان پیاوانی مسوڵمان لەکاتی چێشت ئامادەکردن دەست دەکەن بە نوێژ کردن، ئایا جائیزە نوێژەکە بکرێ، یان نان بخورێو ئینجا نوێژ بکرێ؟

وەڵام/ چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەن، کە بەڵگەن لەسەر پێشخستنی نان خواردن. لە خاتو عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە ﷺ، کە فەرمویەتی: **((اذا وضع العشاء واقيمت الصلاة فابدأوا بالعشاء))** رواه احمد ومسلم، واتە: گەر نان دانراو نوێژ بەرپا کرا، ئەوە دەست بکەن بە نان خواردن.

لە نافعەوە کەوا ئیبن عومەر خواردنی بۆ دانراو، نوێژیش دەست پێکرا، ئەویش نەچوو بۆ

نوێـژ، تـا لـە نـان خواردنەکـە دەبـۆوە، لەکاتێکـدا گـوێی لـە خوێندنـەوەی ئیمـام دەبـوو. (بەخـاری گێڕاویەتیەوە).

(خــەتابی) وتویــەتی: پێغەمبــەر ﷺ بۆیــە فـەرمانی کـردووە بـە پێشخسـتنی نـان خـواردن، تــاوەکو نــەفس پێویســتی خــۆی وەربگــرێو، نوێژخوێنەکە بەدڵێکی ساکینەوە نوێژەکە بکات، نـەبادا بـەهۆی ئـارەزوی خواردنـەوە، نوێژەکـەی بەپەلــە بکــاتو، نــەتوانێ هەڵســێ بەچــاك ئەنجامدانی رکوعو سـوجدەو، ئاگای لـە نوێژەکـە نەمێنێ.

ئــیبن عومـــەر وتویــەتی: پێغەمبــەرﷺ فەرمویـەتی: **((اذا كـان احـدكم علـى الطعـام فـلا يعجل حتـى يقضـي حاجتـه وإن أقيمت الصـلاة))** رواه البخـاري، واتــە: ئەگــەر یــەکێکتان لەســەر نــان خواردن بوو، با پەلە لـە نان خواردنەکـە نـەکات، تا پێویستیی خۆی جێبەجێ دەکات، بـا نوێـژیش دەست پێکرابێت.

هـەروەها خـاتوو عائیشـە گوتویـەتی، گـوێم لـە

پێغەمبەر بووە دەیفەرمو: ((**لا صلاة بحضرة الطعام، ولاهو يدافع الاخبثين**)) رواه أحمد ومسلم وابو داود، واتە: لەکاتی دانانی چێشتدا نوێژ دروست نیە، لەوکاتەش دروست نیە کاتێ ئەو کەسە تەنگاو بێت.

الاخبثين: میزو پیسایی.

جمهوری زانایان گوتویانە: گەر کاتی نوێژەکە فراوان بوو، واتە کاتەکە زۆری مابوو، وا چاکە نان خواردنەکە پێش نوێژەکە بخرێت، ئەگینا واپێویست دەکات نوێژەکە پێش نان خواردنەکە بخرێت. ئیبن حەزمو شافعییەکان گوتویانە: کەر کاتی نوێژەکە کەمیش مابوو وادەخوازرێ، کە نان خواردنەکە پێش بخرێت.

(فقه السنة، المجلد، ص٢٢٥-٢٧٠).

# ژن و مێرد بۆیان جائیزە تەماشای لەشی یەکتری بکەن

**پ ٢٤/ ئایا جائیزە ژن تەماشای هەموو لەشی مێردەکەی بکات، مێردیش تەماشای لەشی خێزانەکەی بکات؟**

**وەڵام/ بەڵێ، جائیزە ژن تەماشای هەموو لەشی مێردەکەی بکات، جائیزیشە پیاویش تەماشای هەموو لەشی خێزانەکەی بکات. خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴾(المؤمنون: ٥-٧) (فتاوى المرأة الشيخ لابن عثيمين، جمع وترتيب محمد المسند، ص٥٤).**

**بەڵام حەنەفییەکانو حەنبەلییەکانو شافعییەکان پێیان باش نەبووە کە تەماشای عەورەتی یەکتری بکەن بەلگەشیان ئەم دوو فەرمودەیە:**

١- لە خاتوو عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت)، کە گوتویەتی: ((ما نظرت أو رأیت فرج رسول الله ﷺ قط))، (رواه ابن ماجة في سننه ج١، ص٢١٧)، واتە: هەرگیز عەورەتی پێغەمبەری خوام نەبینیوە.

٢- لە عەبدوڵلا کوڕی مەسعودەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **((إذا أتى احدکم اهله فلیستتر و لا یتجردان تجرد العیرین))**، (السنن الکبری) للبیهقي، ج٧، ص١٩٢، رواه ابن ابي شیبه والطبراني کما جاء في (الجامع الصغیر) للسیوطي، ج١، ص٤٦، واتە: گەر یەکێك لە ئێوە چووە لای خیزانەکەی، با خۆیان ڕووت نەکەنەوە، وەك ڕووتبوونەوەی گوێدرێژی وەحشی. (المفصل في احکام المراة)

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم دوو حەدیسە (ضعیف)ن، فەرمودەی (ضعیف)یش کاری پێ ناکرێ.

کەواتە: دروستە هەردوو لا تەماشای پاش و پێشی یەکتر بکەن.

# ئافرەت بۆی دروست نیە بە تەنها سواری تەکسی ببێت

**پ ٢٥/ گەر ئافرەت بەتەنها سواری تەکسی ببێ ئایا حوکمەکەی چیە؟**

وەڵام/ جائیز نیە ئافرەت بەتەنهاو بێئەوەی مەحرەمێکی لەگەڵ بێ سواری تەکسی ببێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **((لا يخلون رجل بإمراة الا مع ذي محرم))**، واتە: پیاو ژن بەبێ مەحرەم، بەتەنها یەك نەبن..

بەڵام گەر دوو ئافرەت یان زیاتر پێکەوە بوون، ئەوە جائیزە سواری تەکسی بن، چونکە ئەمە بە (خلوة) دانانرێ. (فتاوي المراة، الشيخ ابن عثيمين، ص٨٩).

پێویستە ئافرەتی مسوڵمان زۆر ئاگادار بێ، بەهیچ شێوەیەكو لە هیچ حاڵەتێك بەتەنها سواری تەکسی نەبێت، بەتایبەتی لەو ڕۆژگارەی ئێستا، کە فیتنەو خراپەکاری زۆر بەربڵاوەو سەربازەکانی شەیتان لە بۆسەدان.

## فڕێدانی قژی بڕاوو نینۆك گوناه نیه

پ ٢٦/ هەنـــدێ خـــەڵکم بینیـــوە بەتایبـــەتی ئافرەتـــان کاتـــێ کـــەنینۆکیان دەکـــەن یـــان قژیان دەبڕن، نینـۆك‌و موەکـان لـەژێر گـل دەشـارنەوە بـە بیـانوی ئـەوەی، گـەر ئـاوا لەســـەر زەوی فـــڕێ بـــدرێ مرۆڤـــ پێـــی گوناهبار دەبێ، جا ئایا ئەمە تاچ ڕادەیـەك لە ڕاستییەوە نزیکە؟

وەڵام/ زانایــان باسـیان کـردووە، کــە مــوی قـژو نینۆك باشتر وایە، بشاردرێتەوە، کـەوا هەنـدێك لـە صـەحابە ئاوایـان کـردووە، بـەڵام گـەر فـڕێ بــدرێن، یــان لــە شــوێنێك دابنــرێن مرۆڤــی مسوڵمان پێی گوناهبار نابێت.

(فتاوى المرأة، الشيخ ابن عثيمين، ص٩٩).

## خواردنی گۆشتی ئاژەڵی
## گاورو جولەکە دروستە

**پ ٢٧/ ئەو گۆشتانەی کە لە وڵاتە نا ئیسلامیەکانەوە بۆمان دێن، ئایا حەڵاڵە خواردنی یان حەرام؟**

وەڵام/ گەر گۆشتەکە گۆشتی ماسی، یان نەهەنگ بوو، ئەوا خواردنی حەلاڵە، چونکە خواردنی گیانلەبەرانی دەریا بەبێ سەربڕین حەلاڵە، جا چ مسولْمان ڕاوی کردبێت، یان غەیری مسوڵمان.

بەڵام گەر گۆشتەکە گۆشتی ئاژەڵ بوو وەك: حوشترو مانگاو مەڕو بزنو، لەو وڵاتانەوە هاتبوون، کە خاوەن دین بوون وەك گاورو جولەکە، کە بە ئەهلی کیتاب دانراون، ئەوا حەڵاڵە گۆشتەکەیان. چونکە سەربڕاوی ئەهلی کیتاب حەڵاڵە بۆمان ﴿وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡ﴾(المائدة- ٥).

بەڵام گەر گۆشتەکە لە وڵاتێکەوە بۆمان هات، کە خەڵکەکەی ئاگرپەرست (مجوس) یا بت پەرستو مولحد بوونو، بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی نەبوو، وەك کۆمۆنیستەکان، ئەوا گۆشتەکەیان خواردنی حەڵاڵ نیە.

(المفصل في احكام المرأة والبيت المسلم في الشريعة الاسلامية، د.عبدالكريم زيدان، الجزء الثالث، ص٥٣، الطبعة الثانية، ١٤١٥-١٩٩٤).

## خاوێن کردنەوەی پۆشاك لە خوێنی حەیز

پ ٢٨/ گەر پۆشاك (جل)ی ئافرەت خوێنی حەیزی پێوەبوو، چۆن لەم خوێنە پاك دەکرێتەوە؟

وەڵام/ چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە لەمەڕ پاککردنەوەی پۆشاکی بەخوێن بوی حەیز، لەمانە وەك:

١- عن اسماء بنت أبي بكر (رضي الله عنهما)، قالت: جاءت إمراة الى النبي ﷺ وقالت:

(أرايت أحدانا اذا اصاب ثوبها الدم من الحيض كيف تصنع؟) فقال رسول الله ﷺ **((تحته، ثم تقرصه بالماء ثم تنضحه، ثم تصلي فيه))**. وفي رواية اخرى عن اسماء انها قالت: (جاءت امرأة الى النبي ﷺ فقالت: أرايت أحدانا تحيض في الثوب، كيف تصنع؟) فقال: **((تحته، ثم تقرصه بالماء، وتنضحه، وتصلي فيه))**. رواه البخاري انظر (فتح الباري بشرح صحيح البخاري، ج١، ص٣٣١-٤١٠)، رواه ابو داود انظر (عون المعبود شرح سنن ابي داود للعلامة ابي الطيب محمد بن الحسن العظيم ابادي ج٢، ص٢٤-٢٥)، واتە: ئەسمای کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خوایان لێبێ) گوتوویەتی: ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: گەر یەکێك لە ئێمە پۆشاکەکەی بە خوێنی حەیز بوو، چی بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەیەکەوەی دەخشێنێ، پاشان بەناو شوێنی خوێنەکە پەنجەی پێدا دێنێ بۆ ئەوەی خوێنەکە لابچێت، پاشان ئاوی پێدادەکەیو نوێژی پێ دەکەیت.

٢- عن ابي هريرة (رضي الله عنـه) إن خولـة بنـت يسار قالت: يارسول الله ﷺ لـيس لـي الا ثـوب واحد، وانـا أحـيضِ فيـه، قـال: ((**فـاذا اطهـرت، فاغسلي موضع الدم ثم صلي فيه**))، قالت: يـا رسـول الله إن لم يخـرج اثـره؟ قـال: ((**يكفيـك الماء لايضرك اثره**))، سنن ابي داود.

٣- وعن معاذة قالت: سألت عائشة: سـألت عائشـة (رضـي الله عنهـا) عـن الحـائض يصـيب ثوبهـا الدم. قالت تغسله، فان لم يذهب اثـره فلـتغيره بشـيء مـن صـفرة. قالـت (اي عائشـة): ولقـد كنت أحيض عند رسول الله ﷺ ثـلاث حـيض جميعا، لا أغسل لي ثوبا.(سنن ابي داود ج٢، ص٢٢).

٤- وعن مجاهد، قال، قالت عائشة: (ماكـان لأحـدنا الأ ثوب واحد تحيض فيه، فاذا أصابه شيء من دم بلته بريقها، ثم قصصته بريقها). (سنن ابي داود ج٢، ص٢٢).

لـــەم فـــەرموودە پیرۆزانـــەدا ئـــەوەمان بـــۆ دەردەكەوێ‌و دەبێتە بەڵگە، كە عـەفو لـە كـەمی خـــوێنی حـــەیز نـــادرێ، بـــەلاَم بـــە شوشـــتنی

پیسیەکەی لادەچێ. گەر خوێنەکە وشك بێت، ئەوا پێش شوشتنەکەی لێك دەخشێنرێ، گەر شوێنەواری خوێنەکە لانەچوو، ئەوە هیچ زیانی نیە، جائیزە بە ڕەنگی زەرد یان زەعفەران شوێنی خوێنەکە بگۆڕدرێ بۆ ئەوەی ڕەنگی خوێنەکە لابچێتو نەمێنێ. چونکە پیس و قیزەونە، یان ڕەنگە ئەوکەسەی بیبینێ کەمتەرخەمی نەشوشتنی بداتە پاڵ خاوەن جل بەخوێنەکە.

خوێنی کەم بە پۆشاکەوە جائیزە بە لیکی دەمی ئافرەتەکە خوێنەکە لابدات، پاشان بە لیکەکەی لە یەکتری بخشێنێ، بەلام گەر خوێنەکە زۆر بوو، ئەوا دەبێ بشۆردرێ، وەك لە فەرموودەکاندا هاتووە.

ئافرەتی حەیزدار پێویست ناکات ئەو پۆشاکەی دابنێ، کە تێیدا تووشی خوێنی حەیز بووە، گەر پۆشاکەکە بەخوێن نەبوو بوو، ئەوە لەسەری نیە جلەکەی بشوات.

(المفصل في احكام المرأة، الجزء الأول).

## ئیحتیلام بونی ئافرەت بەبێ ئاوهاتنەوەی، خۆشوشتنی ناكەوێتەسەر

**پ ٢٩/ گەر ئافرەت ئیحتیلامی بوو، بەڵام ئاوی نەبینی ئایا خۆشوشتنی لەسەرە؟**

وەڵام/ نەخێر خۆشوشتنی لەسەر نیە، بەڵام گەر هەڵساو ئاوی بینیو ئیحتیلامیشی نەبوو بوو، ئەوە خۆشوشتنی دەكەوێتەسەر، هەروەها هەمان حوكم دەكەوێتە سەر پیاو، لەنێو زانایاندا سەبارەت بەمە هیچ جیاوازیەك نیە.

لە خاتوو عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) فەرموویەتی: ((سئل رسول الله ﷺ عن الرجل یجد البلل ولایذكر احتلاما: قال: یغتسل، وعن الرجل یری انه قد احتلم ولا یجد بللا قال: لا غسل علیه، فقالت أم سلیم: فالمرأة تری ذلك، علیها غسل؟ قال ﷺ نعم انما النساء شقق الرجال... پرسیار لە پێغەمبەرﷺ كرا دەربارەی ئەو پیاوەی ئیحتیلامی نەبووە، بەڵام ئاوی هاتۆتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەبێ خۆی

بشوات هەروا دەربارەی ئەو پیاوە پرسیار کرا، کە ئیحتیلامی بووە، بەڵام ئاوی نەهاتۆتەوەو جلی تەڕنەبووە، فەرمووی خۆشوشتنی لەسەر نیە، ئوم سولەیم گوتی: ژنیش شتی وای بەسەر دادێ، خۆشوشتنی لەسەرە؟ پێغەمبەر فەرموی: بەڵێ، ئافرەتان نیوەو هاوشانی پیاوانن)).

السنن الکبری للبیهقي ج١، ص١٦٨.
(المفصل في احکام المرأة، الجزء الأول، ص١٠٢).

## ئافرەت لەکاتی خۆشوشتنیدا لەسەری پێویست نیە کەزیەکانی بکاتەوە

پ ٣٠/ ئافرەت لەکاتی خۆشوشتنیدا ئایا پێویستە کەزیەکانی قژی بکاتەوە؟

وەڵام/ لە خۆشوشتنی جەنابەتدا ئافرەت لەسەری پێویست (واجب) نیە کەزیەکانی بکاتەوە. لەنێو زانایاندا سەبارەت بەم مەسەلەیە، هیچ جیاوازییەکیان نیە لەبەر فەرموودەی ام سلمة، کە وتویەتی: ((یا رسول الله، إني امرأة أشد

ضفر رأسي أفأنقضه لغسل الجنابه: قال: إنّما يكفيك أن تحثي على رأسك ثلاث حثيات، ثم تفيضين عليك الماء، فتطهرين... ئەى پێغەمبەرى خوا! من كەزى سەرم دەبەستم، ئايا بۆ خۆشوشتنى جەنابەت بيكەمەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووى: ئەوەندەت بەسە، كە سێ لوێچە ئاو بەسەر سەرت دابكەيت، پاشان ئاو بەخۆت دابكەيت، كە پێى پاك دەبيتەوە)).

(صحيح مسلم) بشرح النووي، ج٤، ص١١.

كاتێك خاتوو عائشە (ڕەزاى خواى لێبێ) هەواڵى پێدرا كە عبدالله كوڕى عومەر فەرمانى بە ئافرەتان كردووە، گەر خۆيان شوشت، دەبێ كەزى قژيان بكەنەوە، خاتوو عائيشە گوتى: (أفلا يأمرن أن يحلقن رؤسهن؟!) صحيح مسلم بشرح النووي ج٤، ص١١-١٢، واتە: جا بۆچى فەرمانيان پێ ناكات سەريان بتاشن؟!

من و پێغەمبەرى خوا ﷺ لە يەك مەنجەڵ ئاودا خۆمان شوشتووەو لە سێجار زياتر ئاوم بەخۆدانەكردوە.

وايـ ـەچێ، كە ئـيبن عومـەر ئـەو فـەرموودەى ام سـلمة و خـاتو عائيشـەى پـێ نەگەيشـتبێ، هـەروەها لەوانەيـە فـەرمانى كردنـەوەى كـەزى ئافرەتانى بۆ ئەومبێ، لەبەر (ئيحتياط)و واى پێ باش بووبێ، نـەك (واجـب) بـوون. (النووي في شرحه لصحيح مسلم ج٤، ص١٢-١٣)

بێگومان ئافرەت بۆى هەيە گەر حەزى كـرد لـە خۆشوشتنى جەنابەتدا كەزىو قژى بكاتەوە.

المفصل في احكام المرأة والبيت المسلم في الشريعة الاسلامية، .عبدالكريم زيدان، الجزء الاول، ص١٢١.

## ئافرەت بەبێ ئارەزو بۆى هەيە تەماشاى پياو بكات

**پ ٣١/ حـوكمى بينينـى ئـافرەت بـۆ پيـاو لـە رێگاى تەلەفزيۆن يان بينينى سروشتى لـە شەقەمەكاندا چيە؟**

وەڵام/ ديـاره بينينـى ئـافرەت بـۆ پيـاو لــە تەلەفزيۆنو غەيرى تەلەفزيۆن لـە دوو حاڵـەت

بەدەر نیە:

١- بینینێکی ئارەزوانە و بە (شهوة)و ڕابواردن، کە ئـەوەیان حەرامـە، چـونکە فەسـادو فیتنـەی لێدەکەوێتەوە.

٢- بینینێك نـە ئارەزوی تێدایـەو، نـە بـە نیـازی ڕابواردنـەوە بـێ، ئـەوەیان لەسـەر ڕای ڕاسـت (صحیح)ی زانایان، هیچی تێدانییـەو جائیزە. وەك کـە لـە (صـحیح)ی بوخـاری‌و مسـلم هاتووە، کە خاتوو عائشة (ڕەزای خوای لێبـێ) تەماشـای حەبەشـیەکانی دەکـرد، کـە یارییـان دەکــرد، پێغەمبــەریش ﷺ بــە عەباکــەی عائیشـەی داپۆشـت بـوو و برپاریشـی لەسـەر ئەمەدا. (فتاوی المرأة، الشیخ محمد بن صالح العثیمین، جمع وترتیب محمد المسند، ١٤٠٩).

## دوای هیدایەتدان نوێژەکان قەزا ناکرێنەوە

پ ٣٢/ گەر ئافرەتێك پێشتر نوێژی نەکردبێت، پاشان خوای گەورە هیدایەتی بدات‌و دەست بکات بە نوێژەکان، ئایا لەسەریەتی نوێژەکانی پێشوی قەزا بکاتەوە؟

وەلام/ هەرکاتێك مرۆڤ بۆ ماوەی چەند ساڵێك وازی لە نوێژ هێنابوو، پاشان تەوبە بکات‌و پارێزگاری نوێژەکان بکات، ئەوا لەسەری نیە نوێژەکانی پێشووی قەزا بکاتەوە. چونکە گەر مەرجی قەزا کردنەوەی لەسەر دابنرێت، ئەوا زۆر کەس لە تەوبەکردن هەڵدێن، ئەوەی کە پێویستە ئەمر بە تەوبەکار بکرێت، پارێزگاریکردنی نوێژەکانەو زۆر کردنی نوێژە سوونەتەکان‌و کاری چاك‌و نزیکبوونەوەو ترسان لە خوای گەورەیە.

(فتاوي المراة، الشيخ ابن جبرين).

# به دەست کەوتنی ژن و پیاو بە یەکتری دەستنوێژ ناشکێ

پ ٣٢/ ئەمڕۆ لەناو مسولمانانی عەوامدا گومان و تەمێك لەسەر دەستنوێژ هەڵنەگرتنەوە لە ئافرەت دروست بووە، تۆمەت دەدەنە پاڵ مسولمانە مولتەزیمەکان، کە گوایە دینێکی نوێیان داهێناوە. جا حوکمی دەستنوێژ هەڵنەگرتنەوەی ژن و پیاو لە یەکتری لە ئیسلامدا چیە؟

وەلام/ بەپێویستی دەزانم ڕای ئیمامە بەڕێزەکان سەبارەت بەدەست نوێژ هەڵنەگرتنەوە لە ئافرەت بخەمە ڕوو، پاشان تاوتوێکردنی ڕاکانیان و بەدیارخستنی ڕای پەسەند (ارجح) تر.

لەناو ئیمامە بەڕێزەکاندا جیاوازی ڕاو بۆچون سەبارەت بە دەستنتوێژ گرتنەوە لە ئافرەت هەیە، ئەمەش ڕاکانیانە؛

١- مەزهەبی شافعییەکان: بەڕای شافعییەکان گەر پیاو دەستی بە ئافرەتێك بکەوێ، دەستنوێژی بەتاڵ دەبێتەوە، جا دەست کەوتنەکە بە ئارەزو (شهوة) بێ، یان بێ ئارەزوو، ئافرەتەکە پیر بێ، یان گەنج، جوان بێ، یان ناشیرین، مسوڵمان بێ، یان کافر، عەبد بێ، یان ئازاد. دەستنوێژ بەتاڵبوونە کە هەردووکیان (پیاو-ژن) دەگرێتەوە، بەڵگەشیان ئەم ئایەتەیە:
﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ (النساء -٤٣).

٢- مەزهەبی مالکییەکان: بۆچوونیان وایە دەستکەوتن بە ئافرەت بەم مەرجانەی خوارەوە دەستنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.

⋆ مەرجی یەکەم: دەست لێدەرەکە باڵغ بێت.

⋆ مەرجی دووەم: دەست لێدراوەکە لەوانەبێت، کە وەك نێر یان مێ چێژ وەربگرێو یا دەست لێدراوەکە باڵغ نەبووبێ، یان با دەست

کەوتنەکە بە نینۆك یان قژیان لەسەر پەڕۆ بێت، جا دەست کەوتنەکە بەدەست بێت یان بە غەیری دەست.

★مەرجی سێیەم: دەست لێدەرەکە مەبەستی بە دەست لێدانەکەی چێژ وەرگرتن نەبووبێ، جا گەر بەدەست کەوتنەکەی مەبەستی چێژ وەرگرتن نەبوو لە کاتی دەست لێدانەکەیو چێژی وەرنەگرت، ئەوا دەستنوێژی دەست لێدەرەکە بەتاڵ نابێتەوە، با چێژیش لەدوای دەست لێدانەکە وەربگرێ.

٣- مەزهەبی حەنبەلییەکان: بۆچوونی حەنبەلییەکان لە بۆچوونی ناوبانگیاندا ئەوەیە، کە دەستکەوتن بە ئارەزوو لە ئافرەت دەستنوێژ بەتاڵ دەبێتەوە، بەلام دەست کەوتن بەبێ ئارەزوو دەستنوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا دەستی بە خێزانەکەی کەوتووەو خێزانەکەشی دەستی بەو کەوتوە، گەر دەست کەوتن بە ئافرەت دەستنوێژی بەتاڵ بکردایە

ئەوە پێغەمبەر ئەمەى نەدەكرد، عن عائشة (رضي الله عنهما) قالت: ((كان رسول الله ﷺ ليصلي وأنا لمعترضة بين يديه اعتراض الجنازة، حتى إذا أراد أن يوتر مسّني برجله). رواه النسائي، وفي رواية اخرى عن السيدة عائشة إنها قالت: (كنت أنام بين يدي رسول الله ﷺ ورجلاي في قبلة، فاذا سجد غمزني فقبضت رجلي، فاذا قام بسطتهما والبيوت يومئذ ليس بها مصابيح). سنن النسائي ج١، ص٥٨، واتە: خاتوو عائيشة گوتوويەتى: پێغەمبەر ﷺ نوێژى دەكردو منيش لە بەردەمى ڕاكشابووم وەك ڕاكشانى جەنازە، گەر بيويستايە نوێژى وتر بكات قاچى لێدەدام (واتە بە قاچى لە دەستم دەدا بۆ ئەوەى لەبەردەمى لاچم). لە ريوايەتێكى تردا گوتوويەتى: لە بەردەمى پێغەمبەر دەنووستم و هەردوو قاچم لە قيبلە بوو، جا گەر سوجدەى ببردايە، ئەوا دەستى دەدا لە قاچم و منيش قاچم وێك دەهێنايەوە، گەر لە سوجدەش هەڵسايەوە

قاچەکانم دەهێنایەوە شوێنی خۆی‌و بڵاوم دەکردەوە، ئەوکاتەشماڵەکان چرای تێدا نەبوو.

٤- مەزهەبی حەنەفییەکان: بۆچوونی حەنەفییەکان ئەوەیە، کە دەست کەوتنی پیاو بە ئافرەت بە ئارەزوو (شهوة) بێت، یان بێ ئارەزوو، دەستنوێژی پیاوو ئافرەتەکە بەتاڵ ناکاتەوە. بەڵگەشیان ڕیوایەتەکەی خاتوو عائیشەیە کە فەرمویەتی: ((إن النبي ﷺ كان يُقبّل أزواجه، ثم يصلي ولا يتوضأ))، واتە: پێغەمبەری خوا هەندێ لە ئافرەتەکانی ماچ دەکردو پاشان نوێژی دەکردو دەستنوێژی هەڵنەدەگرتەوە.

هەروا وتویەتی ئایەتی ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ مەبەست لە (لمس)ی ئەم ئایەتە جوتبوون (جماع)ە.

٥- مەزهەبی زەیدی‌و جەعفەرییەکان: مەزهەبی زەیدی‌و جەعفەرییەکان بۆچونیان وایە، کە

دەست کەوتنی پیاو بە پێستی ئافرەت، دەستنوێژی هەردووکیان (ژن‌و پیاو) بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵگەی زەیدیەکانیش وەك بەڵگەی حەنەفییەکانە، لە فەرمودەو تەفسیری ئایەتی ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ە.

**قسەی پەسەندتر (ارجح) سەبارەت بە دەستنوێژ بەتاڵ بوونەوەی دەست کەوتن بە ئافرەت:**

ئەم وتەیەی کە پەسەندترو راجیحە لە مەسەلەی دەستنوێژ بەتاڵ بوونەوە ئەوەیە، کە دەست کەوتن بە ئافرەت دەستنوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، مەگەر دەستکەوتنەکە بە ئارەزووەوە بێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەی خوارەوەیە:

**یەکەم: بەڵگەی سوننەتی پێغەمبەر:-**

أ- لە خاتوو عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ): ((ان النبي ﷺ قبل إمراة من نسائه ثم خرج الى الصلاة ولم يتوضا)) سنن ابي داود ج١، ص٣٠٢، جامع الترمذي ج١، ص٢٨١، سنن ابن ماجه ج١، ص١٦٨وواه النسائي

وقال عنه ليس في الباب حديث من هذا الحديث وان كان مرسلا، واتــه: پێغەمبــەر ﷺ یــەکێ لــە خێزانەکانی ماچ کردووەو پاشان چووە نوێژو دەستنوێژی هەڵنەگرتۆتەوە.

ب- بوخاریو موسلیم لە ئەبی سەلەمە (ابن عبدالرحمن)، ئەویش لە عائیشەی دایکی بڕواداران (ڕەزای خوای لێبێ) گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: ( كنت أنام بين يدي رسول الله ﷺ و رجلاي في قبلة، فاذا سجد غمزني فقبضت رجلي، فاذا قام بسطتهما، قالت والبيوت يومئذ ليس فيها مصابيح).

لە ریوایەتێکی تری بوخاریدا سەبارەت بەم مەسەلەیە لە عائیشەوە گێڕاوەتەوە کە گوتویەتی: ((لقد رأيتني و رسول الله ﷺ ليصلي وانا مضطجعة بينه وبين القبلة، فاذا أراد أن يسجد غمز رجلي فقبضتهما)). لەم فەرموودەیەدا بۆمان دەردەکەوێتو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەتەنها دەست کەوتنی پیاو بە ئافرەت دەستنوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

ج- ئیمام موسلیم لەخاتو عائیشه ریوایەت دەكات كە گوتویەتی: "فقد رسول الله ﷺ لیلة من الفراش، فالتمسته فوقعت یدي على بطن قدمیه وهو في المسجد، وهما منصوبتان وهو یقول: **((اللهم اعوذ برضاك من سخطك، ومعافاتك من عقوبتك، واعوذ بك منك لا احصي ثناء علیك انت كما اثنیت على نفسك))**"، واته: شەوێك پێغەمبەر ﷺ لەسەر جێگای نەمابوو، جا دەستم درێژ كردو دەستم بەناو پێیەكانی كەوت، كە لە نوێژدا بوو وە پێیەكانی بە وەستاوی ڕاگیر كردبوو دوعای دەكرد.

هەروەها ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، بە تەنها دەست كەوتن بە ئافرەت دەستنوێژ بەتاڵ نابێتەوە.

ئیمام نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) گوتویەتی: ئەم دەست كەوتنە لەسەر پێیەكانی بەڕووتی نەبووە، بەڵكە قاچی داپۆشراوە، بەڵام ئەمە پێچەوانەی (ظاهر)ی

فەرموودەکەیەو پێچەوانەی وتەکەیەتی: (على بطن قدمیە)، چونکە ئەوەی بە(ظاهر) دیارە ئەوەیە، کە هەردوو پێی پیرۆزی پێغەمبەر ڕووت بوون.

د- نەسائی لە خاتو عائیشە ڕیوایەتی کردووە، کە گوتویەتی: (إن كان رسول الله ﷺ ليصلي وأنا لمعترضة بين يديه إعتراض الجنازة، حتىإذاأراد أن يوتر مسني برجله).

سنن النسائيج١، ص٨٥.

هەروەها ئەم فەرمودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەست کەوتنی پیاو بە ئافرەت دەستنوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

دووەم: ئایەتی ﴿أَوۡ لَـٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾:

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دوو گوتە (قول) هەیە:

١- مەبەست لەئایەتی ﴿أَوۡ لَـٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ بریتیە لە دەست لێدان، جا بە هەر ئەندامێکی تر بە لەشی ئافرەت بکەوێ، ئەوا دەستنوێژەکەی

بەم دەست لێدانە بەتاڵ دەبێتەوە، ئەم وتەیەش لە ئیبین مەسعودەوە ڕیوایەت کراوە.

٢- وتەی دووەم: مەبەست لە ئایەتی ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ بریتیە لە جوتبوون (جماع)، لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەت کراوە، کە گوتویەتی وشەی (اللمس ومَسّ ومباشرة)، لە کیتابی خوا (قورئان)دا مانای جوتبوون دەگەیەنێ.

تفسير ابن كثير ج١، ص٥٠٢-٥٠٣، تفسير الرازي، ج١، ص١١٢، روح المعاني للالوسي، ج٥، ص٥٤.

هەروا ئایەتی ﴿وَإِن طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾(البقرة-٢٣٧). وە لە ئایەتی کە باسی (الظهار) دەکات: ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ﴾(المجادلة- ٣) مەبەست لە (مَسّ) لەم ئایەتی یەکەمداو (تماس)ی (ئایەتی دووەم جوتبوون- جماع)ە.

جا ڕای پەسەند لەو دو (قول)ەی تەفسیری ئایەتەکە، وتەی دووەمە. بە واتای مەبەستی ئایەتەکە جوتبونە، ئەمەش تەرجیحدانی

گـەورەی موفەسـیران (ابـن جریـر)ە (ڕەحمـەتی خوای لێبێ)، وەك كە ابن كثیر لـە تەفسیرەكەیدا لـەوەوە هێناویـەتیو باسـی كـردووە، كـەوا (ابـن جریر) گوتویەتی: شایستەترینی ئـەم دوو قەولـە ئەوەیە، كە لەمەڕ ئەم ئایەتـە ﴿أَوۡ لَـٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ گوتویەتی: مەبەستی جیماعە، نەك دەست لێدان.

پاشـان تەفسـیری ئـەم ئایەتـە ئەوەیـە، كـە مەبەست لە(مَسّ) جیماعە، كە ئـەوەش لـە ئـیبن عەباسەوە نەقلّ كراوەو بڕیاری لەسـەر داوە وەك، كە (شوكاني) گوتویەتی: تەفسیرەكەی ابـن عبـاس ڕاسترین تەفسیرە. چونكە پێغەمبـەری خـوا ﷺ داوای لـە خـوای گـەورە كـرد، كـە لێكدانـەوەی قورئانی فێر بكات.

نیل الاوطار للشوكاني، ج١، ص١٩٥، سبل السلام للصنعاني، ج١، ص٨٨.

## دەست كەوتنی پیاوان بە ئافرەتان خەڵك بەگشتی پێیەوە گرفتارن:-

(ئاشكرایە كە دەست كەوتنی پیـاو بـە ئافرەتـان

لەو شتانەیە، کە خەڵك بەگشتی پێیـەوە گرفتـار بـوون‌و، نـاتوانرێ لێـی دەربـاز بـێ. جا گـەر ئـەم دەست لێکەوتنـە دەستنوێژی بـەتاڵ بکردبایـەوە، ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئوممەتەکەی ڕوون دەکـردەوە. ئـەو ڕوونکردنـەوەش لـەناو هاوەڵانـدا دەبووە شتێکی مەشهورو بـاو، کەسێکیش نـەبووە ئەوەی نەقڵ کردبێ، کە هیچ کامێك لە صەحابە تەنها دەست کەوتنی بە خێزانەکەی، یان غـەیری خێزانەکـەی دەستنوێژی شـکابێ‌و، دەستنوێژی هەڵگرتبێتەوە)

مجموع فتاوى شيخ الاسلام إبن تيمية، ج١، ص٢٣٥.

ئـەوەی لەپێشـەوە باسـکرا لەمـەڕ (لمـس)ی ئـافرەت، کـە لـە ئایەتـە پیرۆزەکـەدا هـاتووە، مەبەستی پێغەمبەر جیماعە، نەك دەست لێدان، جگە لـە جیمـاع، دەست لێـدان، یـان مـاچ کردنـی خێـزان دەستنوێژ بـەتاڵ ناکاتـەوە. بـەڵام ئەگـەر دەست کەوتنەکە بە ئـارەزووەوە بـوو، ئـەوا دەسـت کەوتنەکـە دەسـتنوێژ بـەتاڵ دەکاتـەوە، چـونکە دەست کـەوتن لـەو حاڵەتـەدا گومـانی دەسـتنوێژ

بەتاڵ بوون دروست دەكات، كە ئەویش دەرچونی مەزییە لە دەست لێدەرو دەست لێدراو (ژن‌و پیاو). چونكە (لمس) وەك كە حەنبەلییەكان وتویانە، لە خودی خۆیدا دەستنوێژ بەتاڵ ناكات، بەڵكو سەردەكێشێ‌و بۆ دەرچونی مەزی، یان مەنی.

جا كە ئەو قسە (قول)ەمان بە راجح دانا، كە دەستنوێژ بەدەست كەوتنی بە ئارەزووەوە، بەتاڵ دەبێتەوە. دەستنوێژ بەتاڵبوونەكەش دەست لێدەرو دەست لێدراو دەگرێتەوە، گەر هەركاتێك هەر یەكێكیان هەستیان بە بزوانی شەهوەت كرد، ئەمەش چ دەست لێدەرەكە پیاو بێت‌و، دەست لێدراوەكە ئافرەت بێت، یان بەپێچەوانەوە ئافرەتەكە بێگانە، یان مەحرەمی پیاوەكە بێت، بچووك بێت یان گەورە.

هەروەها گرنگ نیە دەست لێدانەكە لەسەر شتێكەوە بێت، یان بەرووتی، چونكە ئێمە دەستنوێژ بەتاڵبوونمان بەدەست كەوتنی بە شەهوەتەوە بەستۆتەوە. لەوانەیە ئەوشتەی كە

لەسەر پێستی دەست لێدراوەکەیە نەرمو شل بێت، کە زیاتر بزوێنەری ئارەزوو بێت. ئارەزوو بزوانیش دەرچونی ئاوی مەزی بەدواوەیە.

(المفصل في احكام المرأة والبيت المسلم في الشريعة الاسلامية، د.عبدالكريم زيدان، الجزء الاول، ص٩٠-٩٨. الطبعة الثانية، ١٤١٥-١٩٩٤).

## گەر پریشکی ئاو بکەوێتە ناو ئەو ئاوەی دەستنوێژی پێ دەشورێ، ئاوەکە پیس ناکات

پ ٣٤/ لەکاتی دەستنوێژ هەڵگرتن، یان خۆشوشتندا، گەر پریشکی ئاوی هەریەکێکیان بکەوێتە ناو ئەو ئاوەی کە دەستنوێژی پێهەڵدەگیرێ یان خۆی پێدەشورێ، ئایا ئاوەکە پیس دەبێ، یان دەتوانرێ بەکاربهێنرێ؟

وەڵام/ نا، بە پریشکی ئاوی هەر یەکێکیان، ئاوەکە پیس نابێو، ئاوەکە پاکەو بە پاکی دەمێنێتەوە. جائیزیشە کە دەستنوێژەکەی پێهەڵبگیرێو خۆی پێبشۆرێ، چونکە پێغەمبەر خوا ﷺو خاتوو عائیشة (رەزای خوای لێبێ) لە یەك مەنجەڵ ئاودا خۆیان شوشتوەو، دەستیان خستۆتە ناو ئاوەکەو، هەریەکەیان بەیەکتریان گوتوە: بۆمنی لێگەڕێ.

دیارە لەم دەست خستنە ناوئاوە پریشکی ئاوی

لەشیان دەکەوێتە ناو ئاوەکەوە، بەڵام ئەگەر ئەو ئاوە بەکارهاتووەی، کە دەپرژێتە ناو ئاوەکەوە زۆر بێت، ئەوا ئاوەکە بۆ خۆپاکردنەوە ناشێت‌و دروست نیە، ئەمەش لە دوو ریوایەتی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا هاتووە.

هاوڕێیانی ئیمام شافیعی گوتویانە: گەر ئاوە بەکارهاتووەکە زۆر کەوتە ناو ئاوە پاکەکەوە ئەوە دروست نیە دەستنوێژی پێ‌بشۆردرێ، بەڵام گەر ئاوە بەکارهاتووەکە کەم کەوتە ناو ئاوە پاکەکەوە، ئەوە دروستە دەستنوێژی پێ‌هەڵبگیرێ.

ئەگەر کەمێك خۆڵ بکەوێتە ناو ئاوێ کە دەستنوێژی تێدا هەڵدەگیرێ، ئەوا ئەو ئاوە دروستە بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن، بەڵام گەر بوو بە قوڕاو دروست نیە دەستنوێژی پێ‌بگیرێ.

ئەگەر ئاوێك بۆ ماوەیەکی زۆر مابێتەوە، بەهۆی ئەو زۆر مانەوە، بەبێ تێکەڵکردنی هیچ شتێك، کە بیگۆڕێ، ئەوا ئەو ئاوە پاکەو جائیزە دەستنوێژی پێ بشۆردرێ.

جـائیزه لـەکاتی دەسـتنوێژ گرتنـدا دەسـت بخەیتـه نـاو ئـاوی جـام، یـان قـاپ، یـان مەنجەڵـه ئـاوەوە، بـۆ ئـەوەی دەسـتو دەمو چـاوت بشـۆی، چونکه سابت بووە له پێغەمبەری خواوە ﷺ کە دەسـتنوێژی لـه یـەك قاپـدا هـەلگرتووەو دەسـتی پیرۆزی خستۆته ناو ئاوی قاپەکە، بۆئەوەی ئـاوی لـێدەربهێنێ بـۆ شوشـتنی دەمو چـاوو هـەردوو دەستی.

(المفصل في احكام المرأة والبيت المسلم في الشريعة الاسلامية، د.عبدالكريم زيدان، الجزء الأول، ص٦٦-٦٧).

## ئافرەت بۆی دروسته دەرمانی وەستاندنی خوێنی حەیز بەکاربهێنێ

پ ٣٥/ گـەر ئـافرەت بیـەوێ خـوێنی حـەیزی بوەسـتێنێت، بـۆی هەیـه دەرمـان بەکاربهێنێ؟

وەڵام/ بەڵێ، چونکه له ئیمام ئەحمەدەوە هاتووە، کـه گوتویـەتی: (قـەیناکا ئـافرەت دەرمانێـك

بخـوات، کـە خـوێنی حەیزەکـەی بوەسـتێنێ، بەمـەرجێك گـەر دەرمانەکـە بـاوو ناسـراو (معروف) بێت.

(المغني ج١، ص٣٦٨، المفصل في احكام المراة، الجزء الأول، ص١٦٩).

## ئافرەتی حەیزدار بۆی دروستە بۆ پێویستییەك بچێتە مزگەوت

**پ ٣٦/ ئایا ئافرەتی حەیزدار بۆی جائیزە بچێتە مزگەوتو تێیدا بمێنێتەوە؟**

وەڵام/ ئافرەتی حەیزدار بۆی نیە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە. بەڵام بۆی (مباح)ەکە بچێتە ناو مزگەوتو بۆ پێویستییەك تێیدا تێپەڕ ببێت، وەك وەرگرتنی شتێك، یان لەبەرئەوەی ڕێگای بە مزگەوتەوەیە، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە، کە پێغەمبەری خـوا ﷺ بـە خـاتوو عائیشـەی فـەرموو: سەرپۆشـەکەم لـە مزگـەوت بـۆ بێنـە. ئـەویش فـەرمووی: مـن حـەیزدارم، پێغەمبـەر

ﷺ فـەرموی: ((ان حيضـتك ليسـت في يـدك)). (صـحيح مسـلم بشـرح النـووي، ج٢، ص٢٩، إبـن ماجـة، ج١، ص٣٠٧، سـنن البيهقـي، ج١، ص ٣٠٨)، واتـە: حەيزەكـەت لەدەست خۆتـدا نيـە، هـەروەها ئـەو حەديسـەی خـــاتوو عائيشـــە، كـــە پێغەمبـــەر ﷺ فەرموويەتی: ((لا أحل المسجد لحائض)) اخرجه ابو داود نيل الاوطار للشوكانی، ج١، ص٢٠٩.

هەروەها فەرمودەيەكی تر، كە دەفەرموێ: (( لا أحل المسجد لحائض)) اخرجة ابن ماجة.

شـــەوكانی شـــەرعناس ســـەبارەت بـــەم دوو فەرمودەيـــە گوتويـــەتی: ئـــەم دوو فەرمودەيـــە بەلگەن لەسەر سنوور دانـەنانی ماوەی مانـەوەی حـەيزدارو، لـەش پـيس (جنـب) لـە مزگەوتـدا، ئەمەش بۆچونی زۆربەی زانايانـە. هەنـدێكی تـر لە زانايان وەك (داود الظاهری ومزني) گوتويانـە: بـــۆ ئـــافرەتی حـــەيزدار جـــائيزە بچـــێتە نـــاو مزگەوتو تيايدا بمێنێتەوە.

(نيل الاوطار للشوكانی، ج١، ص٢٢٩، المفصل في احكام المرأة، الجزء الأول، ص١٦٩).

## سەرتاشینی منداڵی ساوا، کچیش دەگرێتەوە

پ ٣٧/ لە ئیسلامدا سوننەتە، کە منداڵی تازە لەدایك بوو لە حەوتەمین ڕۆژیدا سەری بتاشرێ، جا گەر منداڵەکە کچ بوو سەرتاشینەکە ئەویش دەگرێتەوە؟

وەڵام/ بەڵێ، جائیزە گەر کچ لەدایك بوو لە حەوتەمین ڕۆژدا سەری بتاشرێ، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە، کە ئیمام مالك لە (الموطأ)دا هێناویەتی و بەیهەقیش ڕیوایەتی کردووە لە خاتوو فاتیمەوە، کەوا سەری زەینەب و ئوم کەلثومی کچی تاشیوە، دیارە ئەم کارەی خاتوو فاتیمەش بە ئاگاداری پێغەمبەر ﷺ بووە.

(المفصل في احكام المرأة، د.عبدالكريم زيدان، الجزء التاسع، ص١٧٥).

## به دەستکێشیشەوە، جائیز نیە ئافرەت تەوقە لەگەڵ پیاوی بێگانە بکات

پ ٣٨/ گەر ئافرەت دەستکێش لەدەست بکات، ئایا بۆی جائیزە تەوقە لەگەڵ پیاو بکات؟

وەڵام/ جائیز نیە ئافرەت تەوقە لەگەڵ پیاوی بێگانە (کوڕی مام، کوڕی خاڵ، مێردی خوشك...هتد) بکات با دەستکێشیش لەدەست بکات، با لە ژێر عەباکەیشی بێت، یان شتێك لەسەر دەستی دابنێت.

(فتاوى المرأة، الشيخ ابن جبرين، جمیع وترتیب محمد المسند).

## ئافرەت بۆی جائیز نیە لەژێر سەرپۆشەکەیەوە قژی لەسەر سەری کۆبکاتەوە

پ/٣٩ ئایا ئافرەت بۆی جائیزە لەژێر سەرپۆشەکەوە قژی لەسەر سەری کۆبکاتەوەو بیبەستێت، کاتێك کە دەچێتە دەرەوە، یان کە لە ماڵەوە پیاوی بێگانەی لێبێت؟

وەڵام/ جائیز نیە، گەر قژ لەسەر سەر کۆبکرێتەوەو ببەسترێت لەلای زانایان ئافرەتەکە بەبەر ئەو قەدەغە (نهي)یە، یان ئەو (تحذیر)ە دەکەوێت، کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەزەری داوە، کە دەفەرموێ: ((صنفان من أهل النار لم أرهما... ونساء كاسيات عاريات مائلات رؤسهن كأسنمة البخت المائلة)).

بەڵام گەر قژی لەسەر پشتی ملیەوە ببەستێت، یان کۆی بکاتەوەو لەژێر سەرپۆشەکەیەوە بەرزنەبێتەوە، ئەمەیان قەیناکە. قژ کۆکردنی لەژێر سەرپۆش و لە

دواوەی عەباکەیەوە بۆیە حەرامە، چونکە وەك نیشانەیەك بەدەردەکەوێت: ئەمەش دەکەوێتە بابی (التبرج)و هۆیەك دەبێت لە هۆیەکانی فیتنە. لەبەرئەوە جائیز نیە.

(فتاوى المراة، الشيخ ابن عثيمين).

## ژن بۆی هەیە داوای تەڵاق بکات، گەر زانی مێردەکەی نەزۆکە

پ٤٠/ لەپاش پێکهێنانی خێزان و بەسەربردنی ماوەیەکی ژیانی هاوسەرایەتی، گەر ژن منداڵی نەبوو، پاشان لە (فحص)دا دەرکەوت، کە عەیبەکە لە پیاوەکەیەو مەحاڵە منداڵیان ببێ، ئایا گەر ژنەکە حەز بکات بۆی هەیە داوای تەڵاق بکات؟

وەڵام/ گەر دەرکەوت نەزۆکییەکە تەنها لەلایەن پیاوەکەیە، ئەوا ژن مافی داواکردنی تەڵاقی هەیە. گەر پیاوەکە تەڵاقیدا ئەوە باشە، ئەگەر

تـەڵاقی نـەدا ئـەوا (قـازی) مـارەیی‌یەکـەی هەڵدەوەشـێنێتەوە، چـونکە ئـافرەتیش مـافی منداڵبونی هەیەو، زۆریش لە ئافرەتان لەپێناو منـداڵ شوو دەکەن. جا گەر ئەو پیاوەی، کە ئافرەتەکـەی مـارەکردووە نـەزۆك بـوو ئـەوا، ئافرەتەکـە مـافی داواکردنـی تـەڵاقی هەیـەو مارەییەکەی هەڵدەوەشێتەوە. لەلای زانایانیش ئەمە بە قسەی پەسەند (راجح)دا دەنرێت.

(فتاوی المرأة، الشیخ إبن عثیمین).

## کردنی نوێژی سوننەت لە سەفەردا پەسندەو جائیزە

**پ٤١/ ئایا لە سەفەردا جائیزە نوێژی سوننەت لەگەڵ نوێژی فەرزدا کورت (قصر) بکرێت؟**

وەڵام/ جمهوری زانایان بۆ چونیان وایە، کە هـیچ کەراهییەتێك نیە، کە نوێـژی سـوننەت بکرێـت لەکاتی سەفەرو لەنوێژی (قصر)دا.

بەلگـەش ئـەم ریوایەتـەی بوخـاریو موسـلیمە

کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا لەماڵی (ئوم هان)یدا خۆی شوشتووەو هەشت ڕکات نوێژی سوننەتی کردووە. حەسەن گوتویەتی: ئەصحابی پێغەمبەر ﷺ سەفەریان دەکردو لەپێش و پاش نوێژە فەرزەکان نوێژی سوننەتیان دەکرد. (فقة السنة، المجلد الأول، ص٢٨٨).

## ئافرەت بۆی هەیە لە گرێبەستی هاوسەرێتی مەرج دابنێ، کە ژنی بەسەرنەیەت

پ٤٢/ ئایا ئافرەت لە مارەبڕینیدا دەتوانێ مەرجی ئەوە بخاتە ناو مارەیی یەکەی کە مێردەکەی ژنی بەسەر نەهێنێ؟

وەڵام/ بەڵێ ئیسلام مافی ئافرەتی داوە مەرج دابنێ لەسەر پیاو، کە ژنی بەسەر نەهێنێ، جا گەر ئافرەتەکە لە عەقدەکەدا مەرجی دانا، ئەوە ئەو مەرجە ڕاستەو دروستە. مافی هەڵوەشانەوەی ئەم عەقدەشی هەیە، گەر

مێردەکەی ئەم مەرجەی بەجێنەهێنا، ئافرەتەکەش هیچ مافی نافەوتێ لەم هەڵوەشانەوەیە، مەگەر بە موخالەفەی مێردەکەی ڕازی بێتو، ئنجا هەڵیوەشێنێتەوە. ئەمەش بۆ چونی ئیمام ئەحمەدەو ئیبن تەیمیەش بەڕاستی داناوە هەروەها (ابن القیم)یش.

**بەڵگەی ڕاستی ئەم بۆچونەش ئەم دوو فەرمودەی پێغەمبەرە:-**

١- بوخاریو مسلم ریوایەتیان کردوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **((ان احق الشروط ان توفوا ما إستحللتم به الفروج)).**

٢- رویا عن عبدالله بن ابي مليكة ام المسور بن مخرمة انه سمع رسول الله ﷺ على المنبر يقول: **((ان بني هشام بن المغيرة إستأذنوني ان ينكحوا إبنتهم من علي بن ابي طالب، فلا آذن لهم، ثم لا آذن ، ثم لا آذن الا ان يريد إبن ابي طالب ان طلق إبنتي وينكح إبنتهم ، فانما**

ابنتي بضعة مني، يريبني ما ارابها، ويؤذيني ما اذاها))، واتە: لە عبدالله کوڕی ئەبی مولەیکەوە کەمسوەری کوڕی مەخرەمە باسی بۆ کردوە، کە لەسەر مینبەر گوێی لە پێغەمبەری خواوە بووە فەرموویەتی: (بەنی هشامی کوڕی موغیرە داوای ئیزنیان لێکردم، کە کچەکەیان لە عەلی کوڕی ئەبی تالب مارەبڕ بکەن، منیش ڕێیان پێنادەم، پاشان ڕێیان پێنادەم، مەگەر کوڕی ئەبی تالب بیەوێ کچەکەم تەڵاق بدات، چونکە ڕاستی کچەکەم بەشێکە لەمن، ئەوەی توشی ئەو دەبێ توشی منیش دەبێ، بە ئازاردانی ئەو ئازار بەمن دەگات).

(دیارە پێغەمبەر ﷺ مەرجی لەسەر ئیمام عەلی داناوە لەکاتی مارەبڕی فاتیمەدا).

(فقه السنة، المجلد الثاني، الطبعة الرابعة، ص١٠٠).

# له چەند حاڵەتێك جائیزه ژن نەهێڵێ منداڵی ببێ

**پ ٤٣/ لە چ حاڵەتێك جائیزە ژن نەهێڵێ منداڵی ببێ؟**

وەڵام/ ئیسلام له بارودۆخی تایبەتیدا سنوردانان بۆ منداڵ بوون (تحدید النسل)ی قەدەغە نەکردووە، جا چ بە وەرگرتنی دەرمانی (منع الحمل) بێ، یان هەر هۆیەکی تری منداڵ نەبوون بێ:

١- گەر پیاو منداڵی زۆر بوو نەیدەتوانی هەستێ بە پەروەردەکردنیان بە پەروەردەیەکی ڕاست (صحیح)ەوە، ئا لەوکاتەدا ڕێی پێدراوە (مباح)ە کە سنوور بۆ منداڵبوون دابنێ.

٢- گەر ژنەکە بێهێزو لاواز بوو، نەخۆش بوو، یان پیاوەکە فەقیر بوو. ئا لەم حاڵەتانەی کە لەسەرەوە باسکران دروستە (تحدید النسل) بکرێ، هەندێ لە زانایان وادەبینن، کەسنوور

بۆ منداڵبوون لەم حاڵەتانە نەك تەنها (مباح)ە بەڵكو (مندوب)ە.

وێڕای ئەم حاڵەتانە ئیمام غەزالی حاڵەتێکی تریشی هێناوە، کەوا گەر ژن لە جوانیەکەی خۆی ترسا، کە جوانیەکەی نەمێنێ، ئەوا مافی ژن و مێردە، کە قەدەغەی منداڵبوون بکەن.

(فقه السنة، المجلد الثالث، الطبعة الرابعة، ص١٦٨).

## دەست کەوتن بە عەورەتی منداڵەکەت، دەستنوێژ ناشکێ

پ ٤٤/ گەر ئافرەتێك دەستنوێژی هەڵگرتبوو پاشان هەستا بە پاککردنەوەی منداڵەکەی دەستی بە عەورەتی منداڵەکەی کەوت، ئایا ئەو ئافرەتە دەستنوێژەکەی دەشکێ؟!

وەڵام/ هەرکەسێك دەستی بە عەورەتی غەیری خۆی، بە ئارەزوو (شهوة)تەوە بکەوێت، دەستنوێژەکەی دەشکێ، بەڵام جیاوازی دەربارەی دەست کەوتن بەبێ ئارەزوو هەیە.

ڕای پەسەند ئەوەیە، کە دەست کەوتن بە عەورەتی منداڵ لەکاتی پاککردنەوەیدا، دەستنوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، چونکە عەورەتی منداڵ جێی شەهوەت نیە، شتێکە، کە خەڵك بەگشتی پێیەوە گرفتارن، گەر بەمە دەستنوێژ بەتاڵ بێتەوە، ئەوە دەبێتە مەشەقەت و زەحمەت لەسەر ئەو کەسە.

(فتاوى إمرأة، الشيخ إبن جبرين، جمع وترتيب: محمد المسند، ص١٨، الطبعة الأولى، ١٤٠٩هـ).

## بە تێپەڕبوونی سێ میل دەتوانرێ نوێژ کورت بکرێتەوە

پ ٤٥/ گەر ئافرەت یان پیاو بیەوێ بچێتە سەفەر، دەبێ ماوەکەی چەند بێت بۆ ئەوەی نوێژەکەی کورت بکاتەوە لە چوار رکاتیەوە بۆ دوو رکات؟

وەڵام/ لە یەحیای کوڕی یەزیدەوە گێڕراوەتەوە،

کەوا گوتویەتی: (سألت أنس بن مالك عن قصر الصلاة فقال أنس كان النبي ﷺ إذا اخرج مسيرة ثلاثة اميال او فراسخ يصلي ركعتين). (رواه احمد ومسلم وابو داود والبيهقي)، واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی دەربارەی کورتکردنەوەی نوێژ، ئەنەس گوتی: پێغەمبەر ﷺ گەر ماوەی سێ میل یان فەرسەخ لەشار دەربچوایە نوێژەکەی دوو ڕکات دوو ڕکات دەکرد. حافظ ابن حجر لە کتێبی(الفتح)دا گوتویەتی: ئەم فەرمودەیە ڕاسترینو ڕاشکاوترین فەرموودەیە لە ڕوونکردنەوەی ئەمەدا.

ئەوەی زانراوو دیارە ئەوەیە، کە یەك فەرسەخ=٥٥٤١ مەتر،و یەك میل = ١٧٤٨ مەتر.

جا دەرکەوت، کە پێغەمبەری خوا کەمترین ماوە، کە نوێژی تێدا کورت کردبێتەوە، بریتیە بووە لە (٣) میل کە دەکاتە پێنج کیلۆمەترو دو سەدو چلو چوار مەتر.

کەواتە مسوڵمان گەر ماوەی ئەمچەند

کیلۆمەترەی کە باسکرا لە شار دەرچووو، دەتوانێ نوێـژ کـورت بکاتـەوە لەچـوار رکاتییـەوە بـۆ دوو رکـات، جگـە لـە نوێـژی بـەیانیو مـەغریب، کـە کورت ناکرێنەوە.

(فقه السنة، المجلد الأول، الطبعة الأولى، ص٢٨٤).

## نوێژ کورتکردنەوە لە دەرەوەی شار دەست پێدەکات

پ ٤٦/ ئایا لـە چ شـوێنێك نوێـژ کورتکردنـەوە دەسـت پێـدەکات، واتـە لـە دەرەوەی شـار، یان لەناو شار؟

وەڵام/ بـــە بۆچـــونی جمهـــوری زانایـــان، کورتکردنەوەی نوێژ بە جیابوونەوە لە شوێنی خـۆتو، دەرچـون لـە شـار دەسـت پێـدەکات. ئەمـەش مەرجێکـەو تـەواو کـامڵ نابێـت، تـا نەچێتە ناو یەکەم ماڵی ئەو شوێنەی، کە بۆی دەچێت.

ابن المنذر وتویەتی: نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەریدا نوێژی کورت کردبێتەوە، مەگەر لەدوای دەرچونی لەشاردا بێت.

ئەنەس وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆم کرد بە چوار ڕکاتیو لە (ذي الحليفة) بە دوو ڕکاتی (رواه الجماعة). بەڵام هەندێ لە (سلف) وادەبینن، کە هەرکەسێك نیەتی سەفەری هەبێت نوێژەکەی کورت دەکاتەوە، با لە ماڵەکەیشیەوە بێت.

(فقه السنة، المجلد الأول، ص٢٤٠).

## بەبێ دیاریکردنی مانەوەی سەفەر دەتوانرێ نوێژ کورت بکرێتەوە

**پ ٤٧/ ئەو کەسەی سەفەر دەکات، چەند ڕۆژ بۆی جائیزە نوێژ کورت بکاتەوە؟**

وەڵام/ سەفەرکار بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە، تا لە سەفەردا بێت. گەر بۆ پێویستییەك

مایـــــەوەو چـــــاوەڕوانی بـــــەجێهێنانی پێویستییەکەی بوو، ئـەوا نوێژەکـەی کـورت دەکاتـــەوە، بـا بـۆ مـاوەی چـەند سـاڵێکیش بمێنێتەوە. چونکە هەر بە سەفەرکار (مسافر) دادەنرێـت. گـەر نیـەتی مانـەوەی هـەبوو بـۆ ماوەیـــەکی دیـاریکراو، ئـەوا (ابـن القـیم) وایداناوە، کـە مانـەوە لـە سـەفەر لـە حـوکمی سەفەر دەرناچێت، جا سەفەرەکە بۆ ماوەیەکی کـەم بێـت، یـان بـۆ ماوەیـەکی درێـژ خایـەن بەمـەرجێ لەوشـوێنە نیشـتەجێ نـەبێت، کـە تێیدا ماوەتەوە.

سـەبارەت بـە مانـەوەی چـەند ڕۆژ، زانایـان ڕای زۆریان هەیە، کە (ابن القیم) کورتی کردۆتـەوەو ڕایەکەشـــی ســـەرکەوتووە، کـــە گوتویـــەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بیسـت ڕۆژ لـە (تـەبوك) ماوەتەوەو نوێژی کورت کردۆتەوەو، بە ئوممـەتی نەفەرمووە، هیچ پیاوێك نوێـژ کـورت نەکاتـەوە، گـەر لـە شـوێنی مەبەسـت زیـاتر مایـەوە. بـەڵام خۆی ئەوەندە ڕۆژە تێیدا مایـەوە، ئەم مانەوەیـە

لەسەفەردا لەحوکمی سەفەر دەرناچێت، با سەفەرەکە کورت، یان درێژە بکێشێ، گەر نیشتەجێی ئەوێ نەبێت و نیازی مانەوەی ئەوشوێنەی نەبێت. دیارە سەلەف و خەلەف سەبارەت بەمە جیاوازی زۆریان هەیە.

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە، کە ئیبن عەبباس گوتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ سەفەرەکانی ماوەی نۆزدە ڕۆژ نوێژی دوو ڕکاتی کردووە، ئێمەش گەر نۆزدە ڕۆژ بمابایەنەوە نوێژمان بە دوو ڕکاتی دەکرد، ئەگەر لەمەش زیاتر بمابایەنەوە نوێژەکانمان بەتەواوی دەکرد.

میسوەری کوڕی مەخرەمە گوتویەتی: لەگەڵ (سەعد)دا لە هەندێ گوندی شام ماوەی چل شەو ماینەوەو، سەعد نوێژی کورت دەکردەوە.

نافع گوتویەتی: (ئیبن عومەر ماوەی شەش مانگ لە (ئازربایجان) ماوەتەوەو نوێژی بە دوو ڕکاتی کردووە، کە بەفر ببووە بەربەست لەبەردەمی چونە ناوی).

حفصی کوڕی عبدالله گوتویەتی: (ئەنەسی

کوڕی مالك دوو ساڵ لە شام ماوەتەوە نوێژی سەفەریی (صلاة المسافر)ی دەکرد.

ئەنەس گوتویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ حەوت مانگ لە (رام هرمز) ماونەتەوەو نوێژیان کورت کردۆتەوە.

حەسەن گوتویەتی: لەگەڵ عەبدورەحمانی کوڕی سەمورە لە (کابول) دوو ساڵ ماونەتەوە نوێژی کورت دەکردەوەو نوێژەکەی (جەمع) نەدەکرد. ئا ئەمە ڕینوێنی پێغەمبەرو هاوەڵە بەڕێزەکانە وەك دەبینی، کە ئەویش ڕاست پێکاو (صواب)ە.

هەر چوار ئیمام (ڕەزای خوایان لێبێ) یەك دەنگن لەسەر ئەوەی، گەر یەکێك بۆ پێویستییەك لە سەفەر مایەوەو چاوەڕوانی جێبەجێکردنی پێویستییەکەی دەکردو، دەیگوت ئەمڕۆ نائەمڕۆ دەردەچم، ئەوا هەردەم بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە. جگە لە ئیمام شافیعی نەبێت. کە لە یەکێك لە دوو قەولەکەی، کە بەلای ئەو ماوەی حەڤدە، یان هەژدە ڕۆژ مایەوە، دوای

ئەوە، نابێ نوێژ كورت بكاتەوە، ابن المنذر لە كتێبەكەی (اشراف)دا گوتویەتی: زانایان كۆڕان لەسەر ئەوەی، كە سەفەركار بۆی هەیە نوێژ كورت بكاتەوە مادام مەبەستی مانەوە نەبێت، با چەندەها ساڵی بەسەردا بڕوات.

(فقه السنة، المجلد الأول، ص٢٨٧-٢٨٨).

## ئیمساكیەی ڕەمەزان بیدعەیەو هیچ ئەسڵێكی نیە

پ ٤٨/ هەندێ لە كاتەكانی مانگی ڕەمەزان دەبینین كە خانەیەكی بۆ دانراوە بە ناوی (امساك) واتە: خۆگرتن لە خواردن و خواردنەوە كە بەر لە (دەستنوێژ) یان (پازدە) دەقیقەی نوێژ بەیانی دادەنرێت، جا ئایا ئەم (امساك)ە هیچ ئەسڵی هەیە؟

وەڵام/ ئەم (امساك)ەی ڕۆژووی ڕەمەزان لە بیدعەكانە، لە سوننەتدا هیچ ئەصڵێكی نیە،

بەلكو سوننەت پێچەوانەیەتی. چونکە خوای گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی: ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾(البقرة- ١٨٧)، واتە: بخۆن و بخۆنەوە تاسپیایی بەیانی لە ڕەشایی فەجردا بەدیار دەکەوێت.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((**ان بلالا یؤذن بلیل فكلوا واشربوا حتى تسمعوا آذان إبن مكتوم فأنه لایؤذن حتى یطلع الفجر**)) واتە: بیلال بەشەو بانگ دەخوێنێ، جا ئێوەش بخۆن و بخۆنەوە، تا ئەو کاتەی گوێتان لە بانگی ئیبن مەکتوم دەبێت. چونکە تاوەکو بەرەبەیان هەڵنەیەت، بانگ ناخوێنێ، لەبەر ئەوە ئەو (امساك)ەی خەڵك دەیکەن زێدەڕۆییە لە دینی خوادا. پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((هلك المتنطعون، هلك المتنطعون، هلك المتنطعون... بە هیلاك چون ئەوانەی لە دین، زیادەڕۆیی دەکەن)).

(أسئلة واجوبة عن اللفاظ ومفاهيم في ميزان الشريعة، محمد العثيمين، الطبعة الأولى١٤١١).

## گەر ئافرەت پێش چلە پاك بۆوە، واجبە نوێژ بكات و ڕۆژو بگرێ

پ ٤٩/ گەر ئافرەتی زەیستان پێش تەواوكردنی چل ڕۆژ پاك بۆوە، ئایا لەسەری واجبە بەڕۆژوو بێ و نوێژ بكات؟

وەڵام/ بەڵێ، هەر كاتێ ئافرەتی زەیستان پێش چلە پاك بۆوە، لەسەری واجب دەبێت بەڕۆژوو بێ، گەر لە ڕەمەزان بوو لەسەریەتی نوێژ بكات. هەروا مێردەكەشی بۆی هەیە جیماعی لەگەڵ بكات، چونكە پاك بۆتەوە.

پ٥٠/ گەر لە ڕۆژی ڕەمەزان چەند دڵۆپە خوێنێكی سادە لە ئافرەتێ بێتەدەر، ئەو خوێنەش بە درێژایی مانگی ڕەمەزان، بە

**بەردەوامی بێتەدەرو ئافرەتەکەش بەڕۆژوو بێ.. ئایا ڕۆژووەکەی تەواوە؟**

وەلام/ بەڵێ، ڕۆژەوەکەی تەواوە، ئەو چەند دڵۆپە خوێنە هیچ نیە، چونکە ئەمە هی دەمارە، لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هاتوە، کە گوتویەتی ئەو چەند دڵۆپانە وەك لوت پژانە، ئەوەیان حەیز نیە.

## کابان بۆی هەیە لە ڕەمەزان تامی چێشت بکات

**پ٥١/ ئایا ئافرەت بۆی هەیە لە مانگی ڕەمەزان تامی چێشت بکات کاتێك خۆی بەڕۆژوو بێت؟**

وەڵام/ بەڵێ، هیچی تێدا نیە لەبەر پێویستی، تامی چێشت بکات، بەلام ئەوەی تامی کردووە قوتی نەدات و فڕێی بداتە دەرەوە.

## ئافرەتی حەیزدار، یان زەیستان گەر پێش نوێژی بەیانی پاك بۆوە، بۆی جائیزە بەڕۆژو ببێت

پ ٥٢/ گەر ئافرەتی حەیزدار یان زەیسان پێش نوێژی بەیانی پاك بۆوە دوای فەجر خۆی شوشت، ئایا بۆی جائیزە بەڕۆژوو بێتو ڕۆژەکەی تەواوە؟

وەڵام/ بەڵێ، ڕۆژوی ئافرەتی حەیزدار، یان زەیستان پێش نوێژی بەیانی، لەدوای بەرەبەیان خۆی بشوات دروستە... هەروەها زەیستانیش. چونکە ئەوکاتە بە ئەهلی ڕۆژوگر دائەنرێتو، وەك ئەو کەسە وایە، کە جەنابەتی لەسەرەو ڕۆژوەکەشی تەواوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾ (البقرة- ١٨٧).

جا کە خوای گەورە ڕێگەی دابێ بەجیماع

کـردن تـا کـاتی بەرەبـەیان، دیـارە خۆشوشـتنیش دەکەوێتە دوای بەرەبەیان. خـاتو عائیشـة (رەزای خـوای لێبــێ) گوتویـەتی: ((ان النبَـي ﷺ کـان يصبح جنبا من جماع أهلـه وهو صـائم))، واتـە : پێغەمبــەری خـــوا بـــە جەنابەتـــەوە ڕۆژی کردۆتەوەو بـەڕۆژوش بـووە. لـە جەنابـەت خـۆی نەدەشوشـت مەگـەر دوای بەرەبـەیان، نـەبێت کـە بەڕۆژووش بووە.

پ ٥٣/ گەر ئافرەت خوێنی بینی و بۆی ڕوون نـەبۆە ئـەو خوێنـە خـوێنی حـەیزە، ئایـا رۆژوی ئەو رۆژەی چۆنە؟

وەڵام/ ڕۆژووی ئەو ڕۆژەی تەواوە، چونکە ئەسڵ ئەوەیە بەدەرکەوێ، کە حەیزە.

(٥٢) سؤال عن احكام الحيض، فضيلة الشيخ محمد بن صلاح العثيمين، دار الضيحاء، ١٩٩٣.

## جائیزە دەرمان بۆ قەڵەوبون بەکاربهێنرێت

پ ٥٤/ ئایا جائیزە ئافرەت دەرمان و خواردن بخوات بۆ قەڵەوبون؟

وەڵام/ بەڵێ، جائیزە ئافرەت ئەو دەرمانە بخوات، کە قەڵەوی دەکات. ئەبوداود لە کتێبی (سنن)دا بابێکی دەربارەی قەڵەوی داناوە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەکارهێنانی دەرمان بۆ قەڵەوکردنی ئافرەت شتێکی باوو ناسراو بووە. لە مەدینە ئافرەتانیش بەکاریان دەهێنا، دیاریشە، کە مسوڵمانان لە پێغەمبەرەوە ڕێ پێدانی بەکارهێنانی دەرمانیان دەزانی.

لە کتێبی (الفتاوى الخانية في فقه الحنيفة)دا هاتووە کە: ئافرەتێك جۆرە خواردنێکی دەخوارد بۆ قەڵەوبونی، جا ئەبو مطيع البلحيني وتی: قەیناکە بیخوات، گەر تێر بوو زیاتری لێ نەخوات.

بەڵام پیاو کەراهەتی هەیە، کە خۆی قەڵەو بکات بە دەرمان و خواردن وەك، کە

حەنەفییەکان ئەمەیان دەربڕیوە. جا لە کتێبی (الفتاوی الهندیة)ی فیقهی حەنەفیدا هاتووە کە: ئافرەت گەر خۆی بۆ مێردەکەی قەڵەو بکات، ئەوا قەیناکا، بەڵام بۆ پیاو کەراهەتی هەیە. بەڵام گەر پیاو زۆر بێهێزو لاواز بوو، ئەوا بۆی دروستە خۆی قەڵەو بکات، ئەمەش لەسەر ئەو ئەساسەی، کە خۆی چارەسەر دەکات، قەڵەویەکەش دەبێت کەم بێت.

(المفصل في احكام لمرأة والبيت المسلم في الشريعة الاسلامية، د.عبدالكريم زيدان، الجزء الثالث، ص١٠٠-١٠١)

## ئافرەت لەبەر سەرما بۆی جائیز نیە نەهێڵێ مێردەکەی لەگەڵی جوت ببێ

**پ٥٥/ ئایا لەبەر سەرماوسۆڵە یان شتی تر، ئافرەت بۆی هەیە نەهێڵێ مێردەکەی لەگەڵی جوت ببێ؟**

وەڵام/ بۆی جائیز نیە، شێخ الاسلام ابن تیمیة گوتویەتی: ئافرەت بۆی نیە قەدەغەی

مێردەکەی لە جوتبون بکات، بەڵکو مێردەکەی بۆی هەیە جیماعی لەگەڵدا بکات. جا گەر توانی خۆی بشوات، ئەوا باشە، ئەگینا تەیەمموم دەکات. (مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٢١، ص٤٥٤).

## گەر ئاو دەست نەکەوت، پیاو بۆی جائیزە لەگەڵ خێزانەکەی جوت ببێ

پ ٥٦/ گەر ئاو دەست نەکەوتو ئاو نەبوو، ئایا پیاو بۆی جائیزە لەگەڵ خێزانەکەی جوت ببێ؟

وەڵام/ بەڵێ، جائیزە وەك، کە ئیبن تەیمیە وای گوتوە، ئەمەش وتەی زانایانە، کە ئەمانەن: (جابری کوڕی زەیدو حەسەنو قەتادەو سەوریو ئەوزاعیو ئیسحاق). بەلگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە، کە ئەبوذەر بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرمووی: ((من لەئاو دورمو خێزانەکەیشم لەگەڵەو تووشی جەنابەت دەبم، ئایا بە لەش

پیسییەوە نوێـژ بکـەم؟) پێغەمبـەر خـوا ﷺ فەرموی: ((الصعید الطیب طهور)) واتـە: خۆڵی پـاك پاکـت دەکاتـەوە، واتـە: تەیـەمموی پێدەکـات. هـەروەها ئـیبن عـەبباس جاریـەکی رۆمـی هـەبوو جیمـاعی لەگـەڵ کـردووە، کـە ئـاویش نـەبووەو نوێـژی بـە تەیـەمموم بـۆ هاورێکانی کردووە، لـەو هاورێیانـەش عـەمماری کوڕی یاسر بووەو نکۆڵیان نەکردووە.

(سنن الكبرى، للبيهقي، ج١).

ئەبی مالکی غەفاری گوتویەتی: بە پێغەمبـەری خوام گوت: (أأجامع إمرأتي وأنا لا أجد المـاء؟ قـال: جامع إمرأتك وإن كنت لاتجد الماء الى عشـر حجـج، إن التراب كافيك) لە کاتێك ئـاوم دەسـت نەکـەوێ، ئایـا بـۆم هەیـە لەگـەڵ خێزانەکـەم جـوت بم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: گەر ماوەی دە ساڵ ئاوت دەسـت نەکـەوت لەگـەڵ خێزانەکـەت جـوت بـە، خۆڵ بەستە تەیەمموی پێ بکەیت.

(البدائع، ص٤٥، المفصل في احكام المرأة، د.عبدالكريم زيدان، ج١، ص١٧٣).

## دەرچوونی هەوا لە داوێنی ئافرەت دەستنوێژ ناشکێنێ

پ ٥٧/ ئەگەر لە داوێنی ئافرەت هەوا دەربچێ، ئایا دەستنوێژ دەشکێ؟

وەڵام/ بە دەرچونی هەوا لە داوێنی ئافرەت دەستنوێژی پێ ناشکێ، چونکە لە شوێنێکی پیسەوە دەرناچێ.

(الشیخ إبن عثیمین) أکثر من (١٠٠) جواب للمرأة – خالد الحسینات.

## بە ڕاوەستانەوە جائیزە خواردن بخورێت

پ ٥٨/ ئایا جائیزە خواردن بەراوەستانەوە بخورێت؟

وەڵام/ بەڵێ، خواردن دروستە بە ڕاوەستانەوە بخورێت، وەك ابن حزم وای گوتوە (المحلی لابن حزم، ج٧، ص٥١٩، لە سنن إبن ماجە، ج٢، ص١٠٩) هاتووە لە ئیبن عومەرەوە کە گوتویەتی (کنا علی عهد

رسـول الله ﷺ نأكـل ونحـن نمشـي)، واتـە لـە سەردەمى پێغەمبەرى خوا ﷺ بە ڕۆیشتنەوە خواردنمـان دەخـوارد. جـا گـەر بـە ڕۆیشـتنەوە خـواردن جـائیز بێـت ئـەوا بـە ڕاوەسـتانەوە لەپێشترو دروستترە.

(المفصل في احكام المرأة، ج٢، ص١٠٩).

## ئاو خواردنەوە بە ڕاوەستانەوە جائیزە

پ ٥٩/ ئایـا جـائیزە ئـاو بەراوەسـتانەوە بخورێتەوە؟

وەڵام/ بەڵـێ جـائیزە، چـونکە پێغەمبـەرى خـوا بەراوەسـتانەوە ئـاوى خواردۆتـەوە وەك ئـیبن عەباس گوتویەتى: (اتیـت النبـي ﷺ بـدلو مـن ماء زمزم فشرب وهو قائم... دەولکەیـەك ئـاوى زەمـزەمم بـۆ پێغەمبـەر هێنـا، ئـەویش بـە ڕاوەستانەوە خواردیەوە) متفق علیـە. هـەروەها ئیمام عەلى (ڕەزاى خـواى لێبـێ) کـە ئاویـان بـۆ

هێنـاوە دەسـتو دەمو چاوى شوشـتووەو پاشـان بە ڕاوەستانەوە بەرماوەى ئاوەکەى خواردۆتەوە پاشان گوتويەتى: خەڵکانێك پێيان ناخۆشـە بـە ڕاوەسـتـانەوە نـاو بوخرێتـەوە، بـەڵام پێغەمبـەر ئەمەى کردووە وەك من کردومە.

عن علي (رضي الله عنـه) (إنـه صـلى الظهـر ثـم قعـد في حـوائج النــاس في رحبــة الكوفــة حتـى حضرت صلاة العصـر،ثـم أتـيبمـاء فشـرب وغسـل وجهه ويديه، وذكر رأسه ورجليه، ثـم قـام فشـرب فضـله وهـو قـائم، ثـم: إن نـاسـا يكرهـون الشـرب قـائما، وإن النبي ﷺ صنع مثل ماصنعت). اخرجه البخاري في الصحيح، ٨١/١٠.

(مصابيح السنة، للإمام البغوي، المجلد الثالث، ص١٧٥).

## بەرماوەی ئادەمیزادو ئەو ئاژەڵەی گۆشتی دەخورێ پاكن

پ ٦٠/ ئایا بەرماوەی ئادەمیزاد، یان ئاژەڵ پاكــە؟

وەڵام/ بەڕای گشت زانایان بەرماوەی ئادەمیزاد چ مسوڵمان، یان كافر پاكە. زانایان یەك دەنگن لەسەر پاكی بەرماوەی ئەو ئاژەڵەی، كە گۆشتی دەخورێ، دروستیشە بەرماوەكەی بخورێتەوە خۆی پێ پاك بكرێتەوە، وەك دەستنوێژی پێ هەڵبگرێ.

بــەرماوەی پشیلەش پیس نیــەو دروستــە بەرماوەكەی دەستنوێژی پێ هەڵبگیرێ، چونكە لە فەرمودەی پێغەمبەر خوادا ﷺ هاتووە كە پشیلە پیس نیە: (**انها لیست بنجس، انها من الطوافین علیكم والطوافات**) لە خاتوو عائیشەوە، كە فەرموویەتی: رایت رسول الله ﷺ یتوضأ بفضلها). رواه ابو داود في (سننة)، واتە خاتو عائیشە گوتویەتی پێغەمبەری خوام بینیوە بە بەرماوەی

پشیله دەستنوێژی هەڵگرتووە.
المفصل في احكام المرأة، د.عبدالكريم زيدان، ج١، ص٣٠.

## خوێنی لێڵ و زەرد لە کاتی حەیز بە خوێنی حەیز دادەنرێت

**پ ٦١/ ئایا خوێنی ڕەنگ لێڵ (الکدرة)و لەکاتی حەیزدا بێتە دەرەوە بەخوێنی حەیز دادەنرێت؟**

وەڵام/ هەرچەندە لەنێو زانایاندا جیاوازیان دەربارەی ئەم جۆرە خوێنە هەیە، بەڵام ڕای پەسند (ارجح) ئەوەیە: بەڵێ، گەر لەماوەی حەیزدا خوێن هاتەدەرەوە، کە ڕەنگی زەرد، یان لێڵ بوو بەو خوێنە، ئەوا بە خوێنی حەیز دادەنرێت. بەڵام گەر خوێنی زەرد، یان لێڵ دوای تەواوبوونی ماوەی حەیز بێتە دەرەوە، ئەوە ئەو خوێنە بەخوێنی حەیز دانانرێت. بە بەڵگەی حەدیسی أم عطية (ڕەزای خوای لێبێ)، کە گوتویەتی: (كنا لا نعد الصفرة والكدرة بعد

الطهر شيئا). لە (نيل الاوطار)ی شوكانی، ج١، ص١٧٣دا هاتووە، كە لەسەر حەديسی أم عطية داود گوتويەتی: حەديسەكە بەلگەيە لەسەر ئەوەی، كە خوێنی ڕەنگ زەردو لێڵ گەر دوای پاكبوونەوە هاتە دەرەوە بە خوێنی حەيز دانانرێت، بەلام لەكاتی حەيزدا گەر ئەم دوو جۆرە خوێنە بێتە دەرەوە بە خوێنی حەيز دادەنرێت).

المفصل في أحكام المرأة، الجزء الأول، ص١٠٧.

## ژن کە منداڵی بوو، خوێنی بەدوادا نەهات، خۆشوشتنی لەسەر نیە

پ ٦١/ گەر ئافرەت منداڵی بوو خوێنی بەدوادا هات، لەنێو زانایان هیچ جیاوازیەك لەسەر واجبییەتی خۆشوشتن نیە. بەلاّم گەر ئافرەت منداڵی بوو خوێنی بەدوادا نەهات واتە (خوێنی منداڵ بوون) ئایا خۆشوشتن دەکەوێتە سەر ئەو ئافرەتە؟

وەلاّم/ وتەی ئیمام الخرقي الحنبلي ئەوەیە، گەر ئافرەت منداڵی بوو، خوێنی لێ نەهات خۆشوشتنی ناکەوێتە سەر، هەروەها خاوەنی کتێبی (المغني، ابن قدامة) گوتویەتی: ئەوەی، کە ڕاست (صحیح) بێت ئەوەیە، کە خۆشوشتنی ناکەوێتە سەر ئەو ئافرەتەی، کە بەمجۆرە منداڵی دەبێ و خوێنی لێ نایەتەدەرەوە، چونکە (واجب) بوون بە

حــوكمێكی شــەرعی (ثابــت) دەبێــت، هــيچ دەقێكيش دەربارەی ئەم خۆشوشتنە نەهاتووە.

(مفصل في احكام المراة، ج١، ص١٠٩).

## بە زۆرلێكردن تەلاق ناكەوێ

پ ٦٣/ گـەر زۆر لـەپياو بكرێـت، كـە ژنەكـەی تەلاق بدات، ئايا تەلاقی دەكەوێت؟

وەلام/ گەر زۆر لە كەسێك بكرێت وشەی كوفری لـەدەم دەربچێت، ئـەوە بـەم كوفركردنـە كـافر نابێـت وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾ (النحـل- ١٠٦). هـەروەها گـەر زۆر لـە يـەكێك بكرێـت ببێتـە مسوڵمان نابێتە مسوڵمان، جا هـەر پيـاوێكيش زۆری لـێبكرێت ژنەكـەی تـەلاق بـدات تـەلاقی ناكەوێت.

ڕيوايــەت كــراوە، كــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرمويەتی: (رفع عن أمـتي الخطأ والنسيان ومـا

إستكرهوا عليه). اخرجه إبن ماجة، وابن حبان، والدار القطني والطبراني والحاكم وحسنه النووي.

ئەمەش بۆچونی مالك‌و شافعی‌و احمدو داودو (فقهاء الأمصار)ە. هەروەها بەلای عومەری كوڕی خەتاب‌و ئیبن عومەرو عەلی كوڕی ئەبی تالیب‌و ئیبن عەباس تەلاق ناكەوێ. بەلام ئەبو حەنیفەو هاوڕێیانی بۆچونیان وایە، كە تەلاقی دەكەوێت. دیارە بەلگەی ئەم بۆچونەیان نیە، كە پێچەوانەی جمهوری سەحابەیە.

(فقه السنة، المجلد الثاني، الطبعة الرابعة، ص٢١٢).

## ژن بە ژنە حەرامە

پ ٦٤/ ناحەزانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام تۆمەتی ژن بە ژنیان خسۆتە پاڵ ئیسلام، زۆر لە خەڵكانی عەشایەر ئەم كارە دەكەن جا ئایا ژن بەژن لە ئیسلامدا حەڵاڵە؟

وەڵام/ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم جۆرە زەواجەی قەدەغە كردووە، كە دەفەرموێ: (لا شغار في

الاسلام). رواه مسلم عن إبن عمر ورواه إبن ماجه من حديث انس بن مالك. قال في الزوائد: إسناده صحيح، ورجاله ثقات، وله شواهد صحيحة ورواه الترمذي من حديث عمران بن الحضين وقال حديث صحيح، واتە: ژن بە ژنە لە ئیسلامدا نیە. لە ئیبن عومەرەوە کە گوتویەتی: (نهى رسول ﷺ عن الشغار) رواه ابن ماجه، واتە: پێغەمبەری خوا ژن بەژنی قەدەغە کردووە. جمهوری زانایان ئەم دوو فەرمودەیان کردۆتە بەڵگە، کە مارەیی ژن بەژن نایەت و، عەقدەکە گرێ نادرێ و، مارەیی یەکە باتڵە.

کەواتە دەرکەوت کە ئیسلام لەم کارە نابەجێیە بەرییەو حەرامیشی کردووە.

(فقه السنة، المجلد الثاني، ص٤٧).

## بۆ ئاژەڵ سەربڕین (بسم الله) بکرێ

پ ٦٥/ گەر ئاژەڵێك سەر ببڕیو لەیاد بکرێ (بسم الله) بگوترێ یان بە عەمدی (بسم الله) نەڵێی ئایا گۆشتی ئاژەڵەکە حەڵاڵە؟

وەڵام/ ئیمام مالك گوتویەتی: هەر ئاژەڵێك سەر ببڕێو ناوی خوای لێ نەهێنرێ، گۆشتەکەی حەرامە. جا گەر (بسم الله)ی لەبیر چوبێت، یان بە مەبەست نەیڵێت. ئەمەش وتەی ئیبن سیرینە. ئیمام ئەبو حەنیفە گوتویەتی: (گەر بە عەمدی "بسم الله"ی نەکردبوو، ئەوا گۆشتەکە حەرامە، بەڵام گەر لەیادی نەبووبێت "بسم الله" بکات، ئەوا گۆشتەکە حەڵاڵە).

ئیمام شافیعی گوتویەتی: گەر ئەوکەسەی ئاژەڵ سەردەبڕێت ئەهلی سەربڕین بێت، گەر بە عەمدی (بسم الله) نەکات، یان لەیادی نەبوبێت، ئەوا گۆشتەکە حەڵاڵە.

عن عائشة إن قوما قالوا يا رسول الله، إن قوما يأتوننا باللحم لا ندري أذكر اسم الله عليه أم لا؟

قال: سموا عليه أنتم وكلوا قالت: (وكانوا حديثي عهد بالكفر) أخرجه البخاري وغيره، واته: لەخاتو عائيشەوە کەوا کۆمەڵێك گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەومی وا هەیە گۆشتمان بۆ دێنن، ئێمە نازانین ئایا ناوی خوایان لێهێناوە، یان نا؟ پێغەمبەر فەرموی: ئێوە ناوی خوای لێبێنن‌و بیخۆن: خاتو عائیشە گوتی: ئەوانە تازە لە کوفر گەڕابوونەوە. فقه السنة، المجلد الثالث، ص١٦٥.

جا لێرەدا بابای مسوڵمان قەناعەتی بەهەر یەکێك لەو ئیمامە بەڕێزانە هەیە، دەتوانێ ئەو ڕایە پیادە بکات.

# بەبێ دەستنوێژ، جائیزە دەست لە قورئان بدرێت

پ ٦٦/ جمهوری فوقەها بۆ چونیان وایە کە بەبێ دەستنوێژ نابێ دەست لەقورئان بدرێت و بخوێندرێتەوە بەڵگەشیان ئایەتی ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴾(الواقعە- ٧٩)ە. ئایا ئەم بۆچونە لەگەڵ ڕاقەی ئەم ئایەتەدا یەك دەگرێتەوە؟

وەڵام/ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾(الواقعة: ٧٧-٨٠)، ئەم چەند ئایەتە باس لە سەرچاوەی قورئان دەکەن کە لە(كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ )ە، (کتاب)یش مانای (اللوح المحفوظ)ە. زۆر لە فوقەها (كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ) بە قورئان دادەنێن و، (مطهرون) بە مسوڵمان لێکدەدەنەوە ئەوانەی، کە دەستی لێدەدەن و دەیخوێننەوە، لەبەرئەوە فەتوایەکی گشتیان

دەرکرد، کە ئەویش جائیز نیە مسوڵمان بەبێ دەستنوێژ دەست لە قورئان بداتو بیخوێنێتەوە، کە ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە کەوا (المطهرون) مانای مسوڵمانە بێ دەستنوێژەکانەو بێ دەست نوێژیش (مطهر) نیە، کەواتە جائیز نیە بێ دەستنوێژ دەست لە قورئان بدان.

وادەبینین ئەمە تێگەیشتنێکی ورد (دقیق) نیە بۆ ئایەتەکەو، ڕاڤەیەکی پڕ بەپێستی خۆی نیە، پاشانیش بەڵگە هێنانەوەیەکی ڕاست نیە. چونکە ئایەتەکان باس لە مسوڵمانە بەدەستنوێژەکان ناکات، بەڵکە باس لە سەرچاوەی قورئان دەکاتو، باس لە ڕێگەی گەیاندنی بە محمد ﷺ دەکاتو گومان (شبهات)ی کافرەکان سەبارەت بە قورئان پوچەڵ دەکاتەوە. چونکە کافرەکان دەیانگوت (جنو شەیتانەکان) قورئانیان داناوەو بە سروش (وحي) بۆ پێغەمبەر دەنێرن، کەواتە قورئان وتەی شەیتانەکان (کلام الله)یە.

قورئـان ئـەم گومـان(شـوبهات)انـەی پوچـەڵ کـردەوەو، لـەزۆر شـوێندا وەڵامـی درۆیـەکانی دانەوە.

جا ئەم ئایەتانەی سورەی الواقعة بڕیارە لەسەر ئەوەی، کە قورئان لە ( فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ )ە، واتـە: لە (لـوح المحفـوظ)ە. شـەیتانەکانو جنۆکـەکانیش ناتوانن دەستی لـێ بدەن، ئەوانـەش، کـە دەستی لـێ دەدەنو هەڵیـدەگرن، یـان دەیگەیـەنن بـە پێغەمبـەر ﷺ فریشـتەن بەتایبـەتی جبریـل (علیه السلام).

سـید قوطـب مانـای ( لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ) بـە فریشتەی راڤـە کـردوە. دیارە ئـەم راڤەیـە تاقـە راڤەی ئـەو نیـە، بـەڵکو جـەماوەرێك لـە یـارانی پێغەمبەرو تابعینو موفەسیرینو زاناکانی پێش ئـەو، ئـەم ڕایـەیان هـەبووەو سـید قوطـب لـە پاشـبەندی ئـەوان بـووە لەوتەکانیانـدا. ئەنەسی کـوڕی مالـك گوتویـەتی: ( فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ) (لـوح المحفوظ)ە و(المطهرون) فریشـتەن، کـە لـە گوناهو

تاوان پاکن.

ئیبن عەباس گوتویەتی: ئەو کتێبەی، کە لە ئاسمانەوە دابەزیوە، (مطهرة)ەکان نەبێت دەستی لێ نادەن، بەواتای فریشتە.

ئەبی عەلی گوتویەتی: ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴾ (الواقعة- ٧٩)، مانای فریشتەکانەو، ئێوە نین ئەی گوناهباران.

سەعیدی کوڕی جوبەیر گوتویەتی: ( فِي كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ) مانای لە ئاسمان، (المطهرون) مانای فریشتەکانە.

کەواتە ئەم ئایەتە بەلگەی جائیز نەبونی دەست لێدانو هەلگرتنی قورئان نیە، لەلایەن بێ دەستنوێژانەوە.

جا لێرەدا دەچینە سەر سەرچاوەی دووەمی تەشریعی ئیسلامی، کە فەرمودەی پێغەمبەری خوایە:

**ئایا هیچ فەرمودەیەکی (صحیح) هەیە دەست لێدان و هەڵگرتنی قورئان لەلایەن بێ دەستنوێژەوە قەدەغە بکات؟**

فەرموودەیەك هەیە: عن أبي بكر بن محمد بن عمر بن حزم عن ابيه عن جده ان النبي ﷺ كتب كتابا الى أهل اليمن وكان فيه : **((لايمس القرآن إلاّ طاهر))**. رواه الحاكم والبيهقي والطبراني والدار القطني.

بەڵام ئەم فەرمودەیە (ضعیف)ە، شەوکانی لە(نیل الاوطار)دا وتویەتی: (لە ئیسنادی ئەم فەرمودەدا سویدی بن ابی حاتمی تێدایە، کە (ضعیف)ە. حازمی ئیسنادەکەی بە(حسن) داناوە، بەڵام ئیمام نەوەوی و إبن کثیر و إبن حزم، حەدیسی حەکیم و بن حزام حەدیسی عمرو بن حزمیان بە (ضعیف) داناوە.

جا لەبەر ئەوەی فەرمودە دەربارەی دەستکەوتنی بێ دەستنوێژ بە قورئان (صحیح) نەبوو، ئایەتەکەش مەبەستی فریشتە بوو،

دەرکـەوت، کـە دەسـت لێـدانی قورئـان بـەبێ دەستنوێژ، دروست (مباح)ە.

لەبەرئـەوە دەڵـێین: مسـوڵمانی بـێ دەسـتنوێژ لەسـەری حـەرام نیـە دەسـت لـە قورئـان بـداتو هـەڵی بگـرێو بیخوێنێتـەوە، بـەڵکو جـائیزەو دەگـرێ گشـتیان ئـەنجام بـدرێ، ئەمـەش لەبـەر دەسـتنەکەوتنی دەقێکـە، کـە حـەرامی بکـات. هەرچـەندە باشـتر وایـە، کـە بـە دەسـتنوێژەوە دەست لە قورئان بدرێت لەبـەر گەورەیی‌و رێـزی قورئان، کە وتـەی خوایە، بـەڵام لێرەدا جیاوازی هەیـە لـە نێـوان کـامڵی و فەزیڵـەتو، لـە نێـوان واجبو ئیلزام.

کۆتـایی وتەکـەمان لەسـەر ڕاسـت پێکـانی تێگەیشتن لەم ئایەتە بە وتـەیـەکی جوانی ئیمـام نـەوەوی دێـنین، کـە لـە (مجمـوع)دا وتویـەتی: مسوڵمانان کۆڕان لەسەر جائیزی قورئان خوێندن بۆ ئەوکەسەی بـێ دەسـتنوێژە، بـەڵام باشـتر وایـە دەستنوێژی بۆ هەڵبگیرێ.

ئیمـام الحـرمینو غـەیری ئـەویش گوتویانـە:

(ناگوترێ خوێندنەوەی قورئان لەلایەن کەسێکی بێ دەستنوێژەوە مەکروهە، چونکە بە (صحیح)ی لە پێغەمبەرەوە هاتووە، کە دەستنوێژی نەبووەو قورئانی خوێندوتەوە).

(المجموع، شرح المهذب النووي ٢:١٦٢، من كنوز القرآن - تصويبات في فهم بعض الايات- د. صلاح عبدالفتاح الخالدي - دار العلم- دمشق الطبعة الثانية ١٤١٦-١٩٩٥، ص٢٢٥).

## لە چەند حاڵەتێکدا دروستە تەیەممووم بکرێ

### پ ٦٧/ ئەو حاڵەتانە چین کە مرۆڤی مسوڵمان تەیەمموومی بۆ دەکات؟

وەڵام/ لەم حاڵەتانەی خوارەوە مسوڵمان دەتوانێ تەیەممووم بکات:

١- گەر ئاوی دەست نەکەوت، یان ئاوی هەبوو، بەڵام کیفایەتی دەست نوێژ، یان خۆشوشتن نەبوو. ئەمەش بە بەڵگەی حەدیسی عمران بن حصین (ڕەزای خوای لێبێ) کە وتویەتی: ((کنا مع رسول الله ﷺ في سفر فصلى بالناس، فاذا

هو رجل معتزل فقال: ما منعك ان تصلي؟ قال اصابتني جنابة، ولاماء، قال: عليك بالصعيد فإنه يكفيك... لە سەفەرێکدا لەگەل پێغەمبەری خوا ﷺ بوین، کە نوێژی بۆ خەڵك کرد، منیش خۆم دورەپەرێز کردبوو، نوێژم نەکرد، پێغەمبەر فەرموی: بۆچی نوێژ ناکەی؟ گوتم: لەشم پیس بووەو، ئاویش نیە، فەرموی بە خۆڵ تەیەممومبکە، چونکە خۆڵەکە بەستە لە جیاتی ئاو))، رواه الشيخان.

وعن ابي ذر (رضي الله عنه) عن رسول الله ﷺ قال: ((ان الصعيد طهور لمن لم يجد الماء عشر سنين... ئەو کەسەی دەساڵ ئاوی نەبێ، خۆڵ پاکیە بۆی لە جیاتی دەستنوێژ بەکاری بێنێ)) وقال الترمذي حديث حسن صحيح).

بەڵام ئەوکەسەی دەیەوێ تەیەممومبکات، پێش ئەوەی تەیەممومبکات، پێویستە داوای ئاو لە یەکێك بکات، یان بە دوای شوێنێك بگەرێت، کە ئاوی لێ نزیکە، جاگەر یەقینی

بوو، کە ئاوی دەستناکەوێ، یان ئاوەکە لێیەوە دوورە، ئەوکاتە لەسەری پێویست نیە بەدوای ئاودا بگەڕێ.

٢- بە بەکارهێنانی ئاوەکە نەخۆشییەکەی زیاد بکات، یان چاك بوونەوەی نەخۆشی یەکەی دوا دەخات. جا ئەمەی چ بە تاقیکردنەوە بزانێ، یان پزیشکێکی متمانەدار پێی بڵێ، بە بەکارهێنانی ئەم ئاوە نەخۆشییەکەی لە چاك بوونەوە دوا دەخات، بەڵگەش ئەم حەدیسەی جابرە (ڕەزای خوای لێبێ) کە گوتویەتی: ((خرجنا في سفر فأصاب رجلا منا حجر، فشجه في رأسه ثم احتلم فسأل اصحابه: هل تجدون لي رخصة في التيمم؟ فقالوا: مانجد لك رخصة وانت تقدر على الماء، فاغتسل فمات. فلما. قدما على رسول الله ﷺ اخبر بذلك فقال: "قتلوه، قاتلهم الله الا سألوا اذا لم يعلموا؟ فإنما شفاء العي السؤال. إنما يكفيه ان يتيمم ويعصر ويعصب على جرحه خرقة ثم يمسح عليه، ويغسل سائر جسده")). (رواه ابو داود وابن ماجه

والدار القطني، وصححه ابن السكن).

٣- گەر ئاوەكە زۆر سارد بوو، زۆرینەی گومانیشی وابێ، كە بە بەكارهێنانی ئاوەكە زیانی پێدەگات. بەلاّم بەمەرجێ نەتوانێ ئاو گەرم بكات، ئەگەر بەكرێنیش بێت. هەروەها ئەگەر چونە گەرماو (حمام)ی بۆ ئاسانو مەیسەر نەبێت. بەلگەش حەدیسی عمرو بن العاصە (ڕەزای خوای لێبێ): كەوا ناردرا بۆ غەزوەی (ذات السلاسل)، كە وتویەتی: احتلمت في ليلة شديدة البرودة، فأشفقت ان اغتسلت ان اهلك، ثم صليت باصحابي صلاة الصبح، فلما قدمنا على رسول الله ﷺ ذكروا ذلك له فقال: ((ياعمر وصليت بأصحابك وانت جنب؟)). فقلت: فتيممت ثم صليت. فضحك رسول الله ولم يقل شيئا. جابێدەنگی پێغەمبەر ئیقرارە، ئیقراریش بە بەلگە دادەنرێ، چونكە پێغەمبەر ﷺ بڕیار لەسەر شتێك نادات كە (باطل) بێت.

٤- گەر ئاوی لێ نزیك بێت، بەلاّم لەوە بترسێت

بەچـــونە لاى ئاوەكـــە زيـــان بـــەخۆى، يـــان بەئابرِوى، يان بەماڵو سامانى دەكـەوێت، يان لـــەهاورِێكانى دادەبـــرِێو بـــەجێى دێڵـــن، يـــان لـەنێوان خـۆىو ئاوەكـە دوژمنێك هـەبێت، كـە لێى بترسێت، جاج ئادەميزاد بێت يان غـەيرى ئادەميزاد، يـان كەسێك بەنـد (سجن) كرابێت، يـــان نـــەتوانێ ئاولـــە بـــير دەربهێنـــێ، لەبـــەر نەبوونى ئامێرى ئاو دەرهێنان، وەكو گـوريسو دۆلكە، جا ئەوكاتـە دەتوانـێ تەيـەمموم بكات. چونكە هەبوونى ئـاو لـەم جۆرە حاڵەتانـە وەك نــەبوون وايــە، هــەروەها كەسێك لــەوە بترســێ بەهۆى خۆشوشتنەكەى گومانى خـراپ دروسـت دەكـاتو، زيـان بـەخۆى دەكـات وەكـو برادەرێك لەماڵى برادەرێكى خـاوەن ژن، شـەو بمێنێتـەوە توشـــى جەنابـــەت ببێـــت، ئەوكاتـــە دروســـتە تەيەمموم بكات.

٥- گەر ئـاوى خواردنـەوەى هەبێـت، ج بـۆ خـۆى بـێ، يـان بـۆ سـەگيش بێـت، يـان ئـەو ئـاوەى پێويست بێت بۆ هەوير، يان چێشتو لابردنـى

پیسی یەك، کە عەفوی لێ نەدرابێت، ئەوا دروستە تەیەمموم بکاتو، ئاوەکە هەڵگرێ بۆ خواردنەوە. ئیمام عەلی (ڕەزای خوای لێبێ) دەربارەی پیاوێك، کە لە سەفەردا بێو تووشی جەنابەت بێتو، کەمێك ئاوی لەلا هەبێتو، لەوە بترسێ تینوی ببێ گوتویەتی: تەیەمموم دەکاتو خۆی ناشوات، دار قطني ریوایەتی کردووە.

ئیبن تەیمیە گوتویەتی: هەرکەسێك تەنگاو بێتو ئاو نەبێت، ئەوەی باشترە کە خۆی بەتاڵ بکاتو، نوێژەکەی بە تەیەمموم بکات لەوەی، کە دەستنوێژەکەی نەشکێنێو نوێژەکەی بە تەنگاوییەوە بکات.

٦- گەر بتوانێ ئاو بەکاربهێنێ، بەڵام لەوە بترسێ بە بەکارهێنانی ئاوەکە (بۆ دەستنوێژ، یان خۆشوشتن بێت) کاتی نوێژەکە بەسەر دەچێت، ئەوا ئەوکاتە تەیەمموم دەکاتو، نوێژەکە ئەنجام دەداتو دوبارەی ناکاتەوە.

(فقه السنة، المجلد الأول، ص٧٧-٧٩).

## تەيەمموم لە جياتى دەستنوێژەو نوێژى زۆرى پێدەكرێ

**پ ٦٧/ ئايا لەكاتى نەبوونى ئاودا تەيەمموم لەجياتى دەستنوێژە؟ ئايا تەيەمموم چەند نوێژى پێ دەكرێت؟**

وەلآم/ بەڵێ، تەيەمموم لەجياتى دەستنوێژو خۆشوشتنە لەكاتێك، كە ئاو دەست نەكەوێت. جا هەر چ شتێك بۆ دەستنوێژ دروستە بۆ تەيەمموميش دروستە، وەك نوێژو دەست دان لە قورئانو شتى تريش، مەرجيش نيە تەيەمموم تەنها لەكاتى هاتنى نوێژەكە بكرێت.

ئەوكەسەى تەيەمموم دەكات بە ئارەزووى خۆى دەتوانێ چەند نوێژ بەو تەيەممومە بكات، جا ئەو نوێژە چ فەرز بێت، يا سوننەت جياوازى نيە، چونكە حوكمى تەيەمموم وەك حوكمى دەستنوێژ وەك يەك يەكسانن، عن أبي ذر (رضي الله عنه) ان النبي ﷺ ((ان الصعيد الطيب طهور المسلم وان لم يجد الماء عشر سنين، فاذا وجد الماء

فليمسه بشرته فإن ذلك خير)). رواه احمد والترمذي وصححه.

(فقه السنة، المجلد الأول، ص٨٠).

بەداخەوە مامۆستای وا هەیە، کە لە رادیۆ بە تێگەیشتنی تەسکی مەزهەبی فەتوا دەدات، کە تەیەممومی یەك نوێژی پێ دەکرێت و، دەبێ دوایی نوێژەکە بگێڕێتەوە. بەڕاستی ئەم فەتوایە بێ بەڵگەیەو زەحمەتکردنی دینی خوایە لەسەر خەڵك.

## گەر ئاوو خۆڵ دەست نەکەوت، دەکرێ نوێژ بکرێت

پ ٦٨/ گەر یەکێك ئاوی دەست نەکەوت و خۆڵیشی دەست نەکەوت تەیەممومی پێ بکا ئایا جائیزە نوێژ بکات؟

وەڵام/ بەڵێ، هەرکەسێك ئاوو خۆڵی دەست نەکەوت، بەهەر حاڵێك بێت و، بەگوێرەی حاڵی خۆی نوێژەکەی دەکات، دوبارە(اعادة)شی

ناكاتەوە. (عن عائشة انها استعارت من اسماء قلادة فهلكت. فارسل رسول الله ﷺ ناسا من اصحابه في طلبها. فادركتهم الصلاة فصلوا بغير وضوء، فلما أتوا النبي ﷺ شكوا ذلك عليه، فنزلت آية التيمم، فقال اسيد بن حضير، جزاك الله خيرا، فوالله مانزل بك أمر قط الا جعل الله لك منه مخرجا. وجعل للمسلمين منه بركة).رواه مسلم.

جا ئەو سەحابىيانە هيچ شتێكيان دەست نەكەوت كە دەستنوێژى پێ بگرن نوێژيان كردووە. ئەوەشيان بۆ پێغەمبەر باسكردو، پێغەمبەريش ئينكارى نەكردن‌و، فەرمانى دووبارە كردنەوەى نوێژەكانى پێ نەكردن.

نەوەوى گوتويەتى: ئەمە بەهێزترين قسەيە بۆ كردنى بە بەڵگە. ئيبن تەيميە گوتويەتى: هەركەسێك ئاوو خۆڵى دەست نەكەوت، ئەوا هەر لە هەمان كات نوێژەكە دەكات‌و، ڕاستتر وايە، كە لەسەرى نيە نوێژەكەى دووبارە بكاتەوە.

(فقه السنة، المجلد الأول، ص٨٢، مختصر فتاوى إبن تيمية، ص٢٤).

# ئافرەت بۆی هەیە
# موی چەناگەو سمێڵی بتاشێت

**پ ٦٩/ گەر ئافرەتێك موی چەناگەی هات، یان موی سمێڵی هات، یان لە نێوان لێوو چەناگەی هات، ئایا دروستە بیتاشێ؟**

**وەڵام/** ئیمام نەوەوی لە (شرح صحیح البخاري للعسقلاني)دا فەرموویەتی: گەر ئافرەت موی ریشی هات، واباشە موەکان بکات، هەروەها گەر مووی لە سمێڵی، یان لە نێوان لێوو چەناگەی هات، واباشە موەکان بکات.

(المفصل في احكام المراة والبيت المسلم في الشريعة الاسلامية، د.عبدالكريم زيدان، الجزء الأول، ص٥٩).

## بە موس مووی بەر دەتاشرێ

**پ ٧٠/ ئایا بە چ شتێك باشە مووی (بەر) بتاشرێ؟**

**وەڵام/** ئیمام نەوەوی گوتویەتی: بۆ لابردنی مووی بەر، سووننەت وایە، کە بە موس بێت، کە ئەمەش بۆ پیاوو ژن یەکسانە، دەگرێ بەهەر شتێکی تریش ئەم مووە لاببرێت.

وا باشە لەچل ڕۆژ زیاتر ئەم مووە نەهێڵرێتەوە، وەك لە حەدیسی ئەنەسەوە هاتووە، کە گوتویەتی: (وقت لنا في قص الشارب وتقليم الاظافر ونتف الابط، وحلق العانة ان لا نترك اكثر من أربعين ليلة) اخرجه الامام مسلم، واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتی بۆ داناین، کە لە چل ڕۆژ زیاتر نەهێڵین سمێڵو نینۆکمان درێژ بێتو مووی بن هەنگڵو مووی بەرمان درێژ ببێت، بەواتای بیانکەین. جا پیاوو ژن بۆخۆیان هەڵدەستن بەتاشینی مووی بەرو کردنی مووی بن هەنگڵ. بەڵام پیاو دەتوانێ مووی هەنگڵی پیاوێکی

تـر بکـات، هـەروەها ژنــیش بـۆی دروسـتـه بـۆ مێردەکەی بکات، بەڵام تاشینی موی بەرجائیز نیە هیچ کەسێك بۆ یەکتری بکەن، جگە لەژن‌و مێرد کە دەتوانن موی بەری یەکتری بکەن.

(المفصل في احكام المراة، د.عبدالكريم زيدان، ج١، ص٥٩،٦٠).

## پاشماوەی ئاوی بەخۆداکردن بە مەبەستی فێنك کردنەوە، جائیزە دەستنوێژی پێ بشورێ

پ ٧١/ گـەر یـەکێك ئـاوی بـەخۆدا کـرد بـە مەبەسـتی خـۆ فێنـك کردنـەوە نـەك بـۆ لابردنی بێ دەستنوێژی ئایا دروستە بەو ئاوەدەست نوێژی پێ هەڵبگیرێ ؟

وەڵام/ بەڵێ، جائیزە بەو ئاوە بەکارهاتووەی، کە یەکێك بە مەبەستی خۆفێنك کردنەوە بەخۆی دادەکات، دەستنوێژ هەڵبگرێ، هەروەها جائیزە دەستنوێژ بەوئاوەش هەڵبگرێ کە جلی تێدا شۆردراوە، چونکە ئەو ئاوە بۆ عیبادەت بەکار

نەهاتووەو، بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن بەكارنەهاتووە.

(المغني، ج١ص٣١، المفصل في احكام المرأة، ج١، ص٦٧).

## چۆنیەتی نوێژكردنی ئافرەتی توش بوو به خوێنەچركە

پ ٧٢/ گەر ئافرەت توشی خوێنە چركە (مستحاضة) بوو، چۆن دەستنوێژ هەڵدەگرێ و نوێژ دەكات؟

وەڵام/ ئافرەتی تووشی بوو بە خوێنەچركە، واتە ماوەی خوێنی حەیزی بەسەرچوو، بەڵام خوێنی بە دوادێ، جا بەم خوێنە دەوترێ خوێنی استحاضة.

بۆچۆنیەتی دەستنوێژ هەلگرتن ئەم فەرمودەیە دەكەینە شێوازی دەستنوێژ هەلگرتن:

((عن عائشة رضي الله عنها ان فاطمة بنت ابي حبيش، جاءت الى النبي ﷺ وقال: اني إمرأة استحاض فلا أطهر، افأدع الصلاة؟ فقال لها: لا انما

ذلك عرق وليس بالحيضة، اجتنبي الصلاة ايام محيضك، ثم اغتسلي، وتوضئي لكل صلاة، ثم صلي، وان قطر الدم على الحصير) (سنن ابن ماجه، ج١، ص٢٠٤)، واته: له خاتو عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ)، كەوا فاتیمەی كچی حوبەیش هاتە لای پێغەمبەر ﷺو گوتی: من توشی خوێنی چركە (استحاضة) بووم‌و پاك نابمەوە، ئایا نوێژ نەكەم؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: نەخێر، نوێژ بكە، چونكە ئەم خوێنە خوێنی دەمارە، نەك حەیز، كاتێ كە لە حەیزدا بیت لە نوێژەكان دووركەوەو مەیكە، پاشان كە پاك بوویتەوە خۆت بشۆ، جا كە خوێن دوای حەیزەكە هات بۆ هەر نوێژێك دەستنوێژ هەلگرەو، پاشان نوێژ بكە، با لە كاتی نوێژەكەیش خوێن بێتەدەرو بكەوێتە سەر حەسیری نوێژەكە.

هەروەها فەرمودەیەكی تریش بەهەمان شێوە هاتووە: ((اخرج البخاري عن عائشة (رضي الله عنها انها قالت: فاطمة بنت ابي حبيش لرسول الله ﷺ: يارسول الله اني لا اطهر، افادع الصلاة؟

فقال رسول الله ﷺ: ((انما ذلك عرق وليس بالحيضة فاذا اقبلت الحيضة فاتركي الصلاة، فاذا ذهب قدرها فاغسلي عنك الدم، صلي)).

ئیبن حجر العسقلانی لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێ: گەر ماوەی حەیزەکە تەواو بوو، ئەوا خۆی دەشوات، پاشان حوکمی خوێنەچرکە وەکو حوکمی بێ دەستنوێژی لێ دێت، جا ئەوکاتە ئافرەتی تووش بوو بە خوێنەچرکە، بۆ هەر نوێژێکی فەرز زیاتری پێ ناکرێت وەك، کە لە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ داهاتووە: (ثم توضئي لكل صلاة) ئەمەش هەمان قسەی جمهورە.

دەستنوێژی ئافرەتی تووش بوو بە خوێنەچرکە بە نەمانی کاتی نوێژەکە دەشکێ، (ئافرەتی –مستحاضە- بۆی هەیە دوو نوێژ (جمع) بکات بەیەك دەستنوێژ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە(حمنەی کچی جەحش) کرد بە (جمع)کردنی دوو نوێژ بەیەك دەستنوێژ، هەروەها فەرمانی بە (سهلەی کچی سهل) کرد بە

هەمان شت).

(المغني، ج١ ص٢٤٢، نيل الاوطار،ج١، ص١٣٣، المفصل في احكام المراة والبيت المسلم د.عبدالكريم زيدان،ج١، ص٧٩-٨٠)

## بەبێ دەستنوێژ، دروستە زیکری خوا بکرێ

**پ ٧٣/ گەر کەسێك بێ دەستنوێژ بێ، ئایا دەتوانێ زیکری خوا بکات و قورئان بخوێنێ؟**

وەڵام/ بەڵێ، بێ دەستنوێژ بۆی جائیزە زیکری خوای گەورە بکات و قورئان بخوێنێ، ئیمام (طحاوي) گوتویەتی: ئەوەی کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەتمان کردووە، ڕێ دراوە بەبێ دەستنوێژی زیکری خوا بکرێ و قورئان بخوێندرێ.

هەروەها لە فەرمودەیەکی تر، کە (طحاوي) ڕیوایەتی کردووە، کەوا پێغەمبەری خوا لە هەموو کاتێکی زکری خوای دەکرد. هەروەها لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە کە گوتویەتی: ئیبن

عەباس و ئیبن عومەر بەبێ دەستنوێژ قورئانیان دەخوێند.

(المفصل في احكام المرأة، ج١، ص١٥١).

## لەش پیس دەتوانێ کەمێك لە قورئان بخوێنێ

پ ٧٤/ گەر یەکێك لەشی پیس بێت واتە تووشی جەنابەت بووبێت دەتوانێ کەمێك لە قورئان بخوێنێ؟

وەڵام/ بەلای مالیکیەکانەوە جائیزە لەش پیس کەمێك لە قورئان بخوێنێ، مەبەستیش لە کەمێك قورئان لەلای ئەوان؛ (آية الكرسي)، (قل هو الله احد) و(قل اعوذ برب الناس) و(قل اعوذ برب الفلق) یان، بۆ مەبەستی خوێندنی بەسەر نەخۆشدا، یان بۆ مەبەستی چاوو زار، یان بۆ بە بەڵگەهێنانەوە لەسەر حوکمێك.

**پ ٧٥/ ئەو کەسەی کە تووشی جەنابەت بێت، بەر لە خۆشوشتنی چ شتێکی بۆ جائیزە بیکات؟**

وەڵام/ ئەوکەسەی لەشی پیس بێ بەر لە خۆشوشتنی، بۆی جائیزە بەو لەش پیسییە بخەوێت. لە ئیبن عومەرەوە کەوا عومەری کوڕی خەتتابی باوکی، لە پێغەمبەری خوای پرسی: گەر یەکێك لە ئێمە لەشی پیس بوو، ئایا بەو لەش پیسییە بخەوێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵێ، گەر یەکێك لەئێوە لەشی پیس بوو دەستنوێژی هەڵگرت بابخەوێ.

(صحيح البخاري، بشرح العيني، ج٣، ص٢٤٢).

شەرع ناسان لە سیفەتی ئەو دەستنوێژە جیاوازیان هەیە، کە ئایا ئەو دەستنوێژەی پێش نووستن واجبە، یان تەنها بۆ (سوننەتە)ە؟

لە وەڵامی ئەمەدا بۆچونی زۆربەی شەرع ناسان (الفقهاء) ئەوەیە، کە ئەو دەستنوێژە بۆ (سوننەتە)ە، نەك بۆ واجب بوون. بۆچونی ابن

حبيب المالكیو مەزهەبی داود الظاهری ئەوەیـە، کە دەستنوێژەکە واجبە.

بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە، کـە ئـەو دەستنوێژە واجـب نیـە، چـونکە پێغەمبـەر ﷺ بـە لەشـی جەنابەتـــەوە خـــەوتووەو دەســــتنوێژی هەڵنەگرتووە، (عن عائشة -رضي الله عنها- قالت: كان رسول الله ﷺ ينام وهو جنب، ولا يمس ماء)، اخرجه الترمذي وابو داود.

صحيح البخاري، بشرح العيني، ج٣، ص٢٤٢.

ئەوکەسەی لەشی پیس بێت بۆی جائیزە بـۆ دووەمـین جـار لەگـەڵ خێزانەکـەی جـووت ببـێ، پـێش ئـەوەی خـۆی بشـوات، یـان خێزانـی خـۆی بشوات، یـان دەسـتنوێژ هـەلگرێ. بـەڵام واباشـە بـۆ هەریەکێك لە ژنو مێـرد بـەر لـە دوبارەکردنـەوەی جیماعەکـەیان عـەورەتیان بشـۆن. (المفصل في أحكام المرأة، ج١، ص١٥٩).

## ئافرەتی حەیزدار، جگە لە فەرجی، دەکرێ چێژی لێ وەربگیرێ

**پ ٧٦/ گەر ئافرەت کەوتە حەیزەوە، ئایا مێردەکەی بۆی هەیە لە ئامێزی بگرێو ماچی بکاو شتی تر بکات؟**

وەڵام/ سەرەتا پیاو بۆی حەرامە لەکاتی حەیزی هاوسەرکەیدا جیماعی لەگەڵدا بکات، بەڵام بۆی هەیە جگە لە (فەرج) بێتە لایو ماچی بکاتو لە ئامێزی بگرێو شتی تری لەگەڵدا بکات ئەوەتا خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتویەتی: (کان رسول الله ﷺ اذا أراد من الحائض شيئا ألقى على فرجها شيئا ثم صنع ماراد) (رواه ابو داود والبيهقي- حديث صحيح)، واتە: پێغەمبەری خوا گەر شتێکی لە خێزانی بویستبایە، کە لە حەیزدابا ئەوا شتێکی بەسەر فەرجی دادەداو، پاشان چی بویستایە دەیکرد. هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إصنعوا كل شيء الأ النكاح) رواه مسلم في صحيحه، واتە:

هەموو شتێك بكەن لەگەڵ ئافرەتی حەیزدار، جگە لە جیماع. بەڵام گەر یەكێك نەیتوانی زاڵ بێ بەسەر نەفسی داو ئارەزووی بەهێز بوو، كە لەگەڵی جوت ببێ، بۆی جائیز نیە، جگە لە سەرەوەری ناوكو لە چۆكەوە بەرەو خوار بچێتە لای هاوسەرەكەی، نەبادا لەوكاتەدا كە ئافرەتەكەی لە حەیزدایە توشی جیماع ببێ. كە ئەمەش حەرامە. (المفصل في احكام المراة، ج١، ص١٦٤).

## ئافرەت كە خوێنی وەستا، مێردەكەی بۆی جائیزە لەگەڵی جوت ببێ

**پ ٧٧/ گەر ئافرەتی حەیزدار ماوەكەی تەواو بوو خوێنەكەی وەستا، ئایا جائیزە مێردەكەی جیماعی لەگەڵ بكات كە هێشتا ئافرەتەكە خۆی نەشوشتووە؟**

وەڵام/ بۆچونی جمهوری فوقەها لەوانە: شافعیو مالكو ئەحمەد ئەوەیە، كە جائیز نیە ئافرەتی

حـەیزدار، کـە لـە خـوێن پـاك بـۆوە تـا خـۆی نەشـوات، نابـێ مێردەکـەی جیمـاعی لەگـەڵدا بکات.

بەڵام بۆچونی ئەبوحەنیفەو هاوڕێیانی ئەوەیە گـەر ئـافرەت خوێنەکـەی وەسـتا زیـاتر لـەماوەی حەیـزەکەی، کە بـەلای ئەوانـەوە (١٠) ڕۆژە، پـێش ئـەوەی خـۆی بشـوات، مێردەکـەی بـۆی جـائیزە جیمـاعی لەگـەڵدا بکـات. بـەڵام گـەر لـە (١٠) ڕۆژەکە کـەمتر خوێنەکـەی وەسـتا جـائیز نیـە تـا خۆی دەشوات. بەڵام (اوزاعی) بۆچونی وایـە گـەر ئـافرەت خوێنەکـەی وەسـتاو (فـەرجی) بـە ئـاو شوشـت، بـا خۆیشـی نەشوشـتبێ مێردەکـەی بـۆی جائیزە جیماعی لەگەڵدا بکات.

هـۆی جیـاوازی شەرعناسـان سـەبارەت بـەم مەسەلەیە ئەو شیمانە (احتمال)یە، کە لـە ئایـەتی ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ﴾ (البقـرة-٢٢٢)دا، کـە ئایـا مەبەسـت لـە فەرمایشـتی خـوای گەورە ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ﴾ پاکبوونـەوەی هـەموو لەشـی

ئافرەکەیـە بـە خۆشوشـتن، یـان مەبەسـتى لـە پاکبوونـەوەى فـەرجى ئافرەتەکەیـە بـە وەسـتانى خوێن؟

جمهـور گوتویانـە: مەبەسـت لـە ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ﴾ وەستانى خوێنى حەیزەو شوشتنى هەموو لەشـى ئافرەتەکەیە، ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ﴾ زیـاتر مانـاى شوشـتن بـە ئـاو دەگرێتـەوە نـەك ئـەو پاکییـە، کـە لـە وەستانى خوێن دروست دەبێت.

لـە ئیـبین عەباسـەوە ڕیوایـەت کـراوە کـە گوتویەتى: ﴿حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ﴾ بە واتاى گەر ئافرەتـان لـە خـوێن پاکبوونـەوەو بـەئاو پاکبوونـەوە ئـەوەیش، کـە دەبێتـە بـەهێزکردنى ئـەم واتانـە ئایـەتى ﴿وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ خـواى گـەورە مـەدحیان دەکـات بـەوەى، کـە خۆیـان پـاك دەکەنـەوە، کـە برتییـە لـە خۆشوشـتنیان، نـەك خـوێن وەسـتان. وتـەى جمهـوریش ڕاى پەسـەند (ارجح)ەبەو بەلگانەى، کە هێناویانەوە.

جا گەر ئافرەتەکە ئاوى دەست نەکەوت خۆى

پـێ بشـوات، یـان ئـاوی دەسـت کـەوت، بـەڵام بـە بەکارهێنانی ئاوەکە توشی زیان دەبوو، ئەوا بۆی جـائیزە لـەجیاتی خۆشوشـتن، تەیـەمموم بکـات، ئنجا مێردەکەی جائیزە جیماعی لەگەڵدا بکات.

(الفصل في احكام المراة، ج١، ص١٦٥).

بـەڵام بـۆ ئـەم ڕۆژگـارەی ئـەمڕۆمان، مـن ڕای ئیمامی (ئەوزاعی)م پـێ ڕاسـتو پەسندە، کە بـۆ ئەمڕۆ گونجاوترە.

## ئافرەتی حەیزدار بۆی هەیە قورئان بخوێنی

پ ٧٨/ ئافرەتی حەیزدار بۆی جائیزە قورئان بخوێنێ و یادی خوا بکات؟

وەڵام/ جمهـور دەڵـێن: جـائیز نیـە ئـافرەتی حەیزدار قورئان بخوێنـێ، کە ئـەم فـەرمودەیان کردۆتە بەلگە: (لا یقرأ الجنب ولا الحائض شیئا مـن القـرآن). بـەڵام ئـیبن حـزم الظـاهري گوتویەتی: خوێندنەوەی قورئان کارێکی باشـە، هـیچ بەلگەیـەکی شـەرعی نیـە، کـە ئـافرەتی

حـەبزادار، یـان لـەش پـیس (الجنـب) قەدەغـە بکات لە قورئـان خوێندنـەوە. ئـەم (آثـار)انـەی، کـە ئەوانـەی دەڵێن جائیز نیـە حـەیزدار، یـان لـەش پـیس قورئـان بخوێنـێ، کـە پشـتیان پـێ بەستووەو کردویەتیان بە بەڵگە، (صحیح) نیە.

مالکییەکانیش گوتویانە: ئافرەتی حەیزدار بۆی هەیـە قورئـان بخوێنـێ، چـونکە ڕۆژانـی حـەیز درێـژەی هەیـە، جـا گـەر لـە قورئـان خوێنـدن قەدەغـە بکرێـت لـەوە ئەترسـین قورئـان لـەبیر بکات.

(السـنن الكـبرى، للبيهقـى، ج١، ص٣٠٩، البـدائع، ج١، ص٣٨-٤٤ المغني، ج١ص٢٠٧، المحلي، لابـن حـزم، ج١، ص٧٧، الروضـة البهيـة شـرح المعـة الدمشـقية، ج١ص٣٢، حاشـية العـاوي، ج١، ص٨١، المفصل في أحكام المراة، ج١، ص ١٦٨).

## ئافرەتی زەیستان دەتوانێ قورئان بخوێنێتەوە

**پ ٧٩/ ئایا ئافرەتی زەیسان دەتوانێ قورئان بخوێنێتەوەو زیکری خوا بکات؟**

وەڵام/ بەلای جمهورەوە ئافرەتی زەیستان وەکو ئافرەتی حەیزدارە لەو حوکمەدا، کە قەدەغەیە قورئان بخوێنێتەوە. بەڵام بەلای مالکییەکانەوە جائیزە ئافرەتی زەیستان قورئان بخوێنێتەوە، وەکو کە بۆ حەیزداریان جائیزە کردووە، کە قورئان بخوێنێتەوە، زەیستانیش لە ئەحکامدا وەکو حەیزدارە. شێخ الاسلام ابن تیمیة گوتویەتی: (بەنسبەت خوێندنەوە. قورئان خوێندنی زەیستان، گەر لەوەنەترسێت، کە قورئان لەبیر دەکات، با قورئان نەخوێنێتەوە، بەڵام گەر لەوەترسا لەبیری بچێتەوە، با بیخوێنێتەوە لەسەر وتەی یەکێك لەدوو ووتەی زانایان). ظاهرییەکانیش ڕێ بەحەیزدار دەدەن قورئان بخوێنێتەوە، چونکە ئەوان بۆ قورئان خوێندن پاکیەتی (الطهارة) بەمەرج

دانـانێن، زەیسـتانیش وەکـو حـەیزدار وایـە.
کەواتە بەلای ئەوانەوە جائیزە زەیستان قورئان بخوێنێتەوە.

بەلای جمهوردوە زەیستان وەکو حەیزدار، نابێ دەسـت لـە قورئـان بـداتو هـەڵی بگرێـت، بـەڵام بەلای مالکیەکان بۆ زەیستان جائیزە دەست لە قورئـان بـداتو هـەڵی بگرێـت، گـەر زەیسـتان مامۆستا بوو، یان فێرخواز بوو، هەروەك حوکمی حەیزدار وایە.

(البدائع) ج١، ص٤٢، (حاشیة الدسوقی) ج١، ص١٧٥، (حاشیة العاوي) ج١، ص٨١، (المفصل في احکام المراة، ج١ ص١٧٠).

## ئافرەت لە نوێژدا لەسەری واجب نیە پێیەکانی دابپۆشێ

**پ ٨٠/ لـە نوێـژدا ئـافرەت پێویسـتە کـوێی دابپۆشی و، ئایا هەمو لەشی عەورەتە؟**

وەڵام/ شەرعناسان (الفقهاء) جیاوازییان سەبارەت بـە سـنوری عـەورەتی ئـافرەت لەنوێـژدا هەیـە.

بەلای حەنبەلییەكان هەموو لەشی ئافرەت عەورەتە جگە لە ڕوخسار، هەردوو دەستیش دوو ڕیوایەتی هەیە لە مەزهەبی حەنبەلییەكان لە ئیمام ئەحمەدی كوڕی حەنبەلەوە.

بەڵام بەبۆچونی مالكو ئەوزاعیو شافیعیو ظاهرییەكان هەموو لەشی ئافرەت عەورەتە، جگە لە ڕوخساریو هەردوو دەستەكانی. بۆچونی حەنەفییەكانیش ئەوەیە، كە لەشی ئافرەت هەموو عەورەتە، جگە لە ڕوخسارو هەردوو دەستیو هەردوو پێیەكانی، چونكە هەردوو پێیەكان بەزۆری وەكو ڕوخسارو هەردوودەست بەدیار دەكەون.

بەڵگەی ئەوانەی، كە دەڵێن هەردوو پێیەكان عەورەتە فەرموودەیەكە: (عن ام سلمة انها سألت النبي ﷺ اتصلي المرأة في درع وخمار ليس عليها ازار؟ قال: اذا كان الدرع سابغا يغطي ظهور قدميها).(سنن ابي داود وشرحه عون المعبود، ج۲، ص۲٤۳).

لەبەرئەوە دەكرێ بوترێ: داپۆشینی هەردوو

پێیەکان لە نوێژدا وەکو سوننەتە، نەك لەڕووی پێویست کردن، کەواتە پێیەکان لەو عەورەتە نیە، کە پێویست بێ دابپۆشرێ.

(المفصل في احكام المراة، ج١، ص١٩٠).

**پ ٨١/ بۆ ئەنجامدانی نوێژی بە کۆمەڵ (جماعة) گەر ئیمامەکە پیاو بێت و ئافرەتێك، یان زیاترو یەك پیاو ئامادە بێت، ئایا ڕاوەستانیان چۆن دەبێت؟**

وەڵام/ پیاوەکە لەلای ڕاستی ئیمام ڕادەوەستێ و ئافرەتەکە، یان ئەو چەند ئافرەتەی تر لە دوای هەردووکیان ڕادەوەستن.

(مغني المحتاج)، ج١، ص ٢٤٦، (الشرح الصغير)، للدردير، ج١، ص١٦٤، المغني، ص٢١٥.

بەڵام گەر لەگەڵ ئیمام دوو پیاوو ئافرەتێك هەبێت ئەوا دوو پیاوەکە لەدوای ئیمام دەوەستن و ئافرەتەکە لەدوای هەردوکیان دەوەستی. (عن انس عن مالك ﷺ قال صليت انا

ويتيم في بيتنا خلف النبي ﷺ وامي ام سليم خلفا) رواه البخاري.

**پ ٨٢/ ئەدى گەر لەگەڵ ئيمامدا كۆمەڵێ لە پياوو ئافرەتو منداڵو نێرەموك هەبوون، ئايا ڕاوەستانيان چۆن دەبێت؟**

وەلام/ لە كتێبى (البدائع)ى كاسانى هاتووە: (گەر پياوو ئافرەتو كوڕو نێرەموكو كچى هەرزەكار هەبوونو ويستيان بەكۆمەڵ نوێژ بكەن، ئەوا لەدواى كوڕەكان، نێرەموكەكان، لەدواى ئەوانيش ئافرەتەكان، لەدواى ئەوان كچە هەرزەكارەكان، لەلاى حەنيەلييەكانيش بەهەمان شێوەيە).

(المفصل في احكام المراة، ج١، ص٢٤٤).

## گەر ئافرەت لە ریزی پیاوان بۆ نوێژی بەکۆمەڵ وەستا، نوێژەکەی دروستە

پ ٨٣/ گەر ئافرەت لەریزی پیاوان وەستا بۆ نوێـژی بەکۆمـەڵ ئایـا نوێژەکـەی بـەتاڵ دەبێتەوە؟

وەڵام/ نـەخێر، گـەر ئـافرەت لـەریزی پیـاوان بـۆ نوێژ وەستا کەراهەتی هەیەو نوێژەکەی بـەتاڵ نابێـتەوە، ئەمەش بۆچونی حەنبەلییەکانە.

(المغني)،ج٢،ص٢٠٤، (المفصل في احكام المراة،ج١، ص٢٤٥).

## دەکرێ ژن گـەر زاناتر بوو، ئیمامەتی بۆ مێردەکـەی بکات

پ ٨٤/ ئایـا جـائیزە ئـافرەت ببێتـە ئیمـام بـۆ پیاوان؟

وەڵام/ نـەخێر جـائیز نیـە، کـە ئەمـەش وتـەی گشـــت شەرعناســـەکانە. بەلگـــەش ئـــەم

فەرمودەیـەی پێغەمبـەرە ﷺ کـە دەفـەرموێ: ((لا تـؤمم إمـرأة رجـلا)) (رواه ابـن ماجـه في سـننه)، بڕوانە (سبل السلام)، ج٢، ص٢٨.

بـەڵام ئـافرەت لـە مـاڵی خۆی، جـائیزە ببێتـە ئیمام بـۆ مێردەکەی، گـەر ئافرەتەکـە شایستـەتر بـوو لـە مێردەکـەی بـۆ ئیمامـەتی، بـە واتـای لـە مێردەکــەی شــارەزاتر و زانــاتر بــو، چــونکە پێغەمبـەر ﷺ فـەرمانی بـە (أم وەرەقـەی کچـی نوفل) کرد، کە ببێتە ئیمام بۆ مێردەکەی.

(المفصل في احكام المراة، ج١، ص٢٥٢.

## پ ٨٥/ ئایا جـائیزە ئـافرەت ببێـتە ئیمـام بـۆ ئافرەتان لە نوێژی بە کۆمەڵ؟

وەڵام/ بەڵێ، جـائیزە چونکە دایکانی بـڕواداران نوێـژیان بـۆ ئافرەتـان کـردووەو بـە دەنگـیش خوێندویانە: روي عن لطية الحنفيـة ان عائشـة ام المؤمنين أمتهن في صلاة الفريضة، وعـن تميـة عن عائشة (رضـي الله عنهـا) انهـا أمـت النسـاء في صلاة المغرب، فقامت وسطهن وجهـرت بـالقراءة

وروي ايضا ان ام سلمة ام المؤمنين (رضي الله عنها) كانت تؤم النساء في رمضان وتقف معهم في الصف وعن إبن عمر إنه كان يأمر جارية له ان تؤم نساءه في رمضان.

المحلى، ج٤، ص١١٩-١٢٠، المفصل في احكام المرأة، ج١، ص٢٥٤).

## بۆ ئیمامەتی کردنی ئافرەتان، ئیمامەکە لە ناوەڕاستیان دەوەستێ

پ ٨٦/ گەر ئافرەت ببێتە ئیمام بۆ ئافرەتان لە نوێژدا، ئایا لە کوێ دەوەستێ؟

وەڵام/ ئافرەتە ئیمامەکە لە ناوەڕاستی ڕیزەکە لە نێوان ئافرەتەکان دەوەستێ، کە ئەمەش لە خاتوو عائیشەو ئوم سەلەمە (ڕەزای خوایان لێبێ) ڕیوایەت کراوە، لە ئیبن عەباسەوە، کە گوتویەتی: ئافرەت دەتوانێ ئیمامەتی ئافرەتان بکات، کە لە ناوەڕاستیان دەوەستێ. ئەمەش وتەی شەرع ناسانەو هیچ خیلافی تێدا نیە.

(المفصل في احكام المرأة، ج١، ص٢٥٤).

# ئافرەتى حەيزدار بۆى جائيزە سوجدەى تيلاوە ببات

**پ ٨٧/ ئافرەتى حەيزدار بۆى جائيزە سوجدەى تيلاوە ببات؟**

**وەڵام/** بە ڕاى جمهور، نابىَ ئافرەتى حەيزدار سوجدەى تيلاوە ببات، بەڵام لەلاى ظاهرييەكان جائيزە ئافرەتى حەيزدار سوجدەى تيلاوە ببات. چونكە ئەوان بۆ سوجدەى تيلاوە پاكييەتى (الطهارة) بەمەرج دانانێن، ئەو سوجدەيە بە نوێژ دانانرێت، لەبەرئەوە ئەوەى بۆ نوێژ بەمەرج دادەنرێت بۆ سوجدەى تيلاوە بەمەرج دانانرێت.

(المفصل في احكام المرأة، ج١، ص٣٣٤).

## ئافرەت لەکاتی حەیزدا، تەڵاقی ناکەوێ

**پ ٨٨/ گەر ئافرەت لەحەیزدا بوو، مێردەکەی تەڵاقی دا ئایا تەڵاقەکەی دەکەوێت؟**

وەڵام/ ڕای پەسەند (راجح) ئەوەیە، کە شێخ الاسلام إبن تیمیة (ڕەحمەتی خوای لێبێ) هەڵیبژاردوە، کەوا تەڵاق لەکاتی حەیزدا ناکەوێتو تەڵاقێکی (ماضی) نیە. چونکە پێچەوانەی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوایە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: **((من عمل ليس عليه امرنا فهو رد))**. بەڵگەش بۆ نەکەوتنی تەڵاقەکە حەدیسەکەی عبدااللەی کوڕی عومەرە، کە کاتێك هاوسەرەکەی لە حەیزدا دەبێتو تەڵاقی دەدات، ئینجا ئەمە بە پێغەمبەر دەگات، پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش دەبێتو دەفەرموێ: بە عبدالله بڵێن، با هاوسەرکەی بگەڕێنێتەوە لای خۆی، با وازی لێ بێنێ، تا لە حەیزەکەی پاك دەبێتەوەو، پاشان توشی حەیز دەبێتەوە. جا ئەوکاتە گەر ویستی،

دەتوانێ تەڵاقی بدات، یان تەڵاقی نەدات.
(فتاوى المرأة، أجاب عليها الشيخ محمد بن صالح العثيمين، جمع وترتيب: محمد المسند).

## گەر ئافرەت قژی ڕوتاوە بۆی جائیزە باڕۆکە بەکاربهێنێ

**پ ٨٩/ گەر ئافرەتێك توشی قژ ڕووتانەوە بوو هیچ مووی بەسەرییەوە نەما، ئایا بۆی جائیزە قژی باڕۆکە بەکاربهێنێ؟**

وەڵام/ لە بنەڕەتدا بەکارهێنانی قژی باڕۆکە حەرامە. چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لەوکەسە کردووە، کە باڕۆکە بەکاربهێنێ و داوای ئەم قژە بکات. بەڵام گەر ئەو حاڵەتەی، کە لە پرسیارەکەدا هاتووە بەسەر ئافرەتەکەدا بێت، ئەوا بۆی جائیزە قژی باڕۆکە بەکاربهێنێ، بۆ ئەوەی ئەم عەیبە دابپۆشێ. چونکە لابردنی عەیب جائیزە، لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ ئیزنی بەو پیاوەدا، کە لە

جەنگدا لوتی بڕابوو، لوتێکی لە ئاڵتون بۆخۆی بکات.

(فتاوى المرأة، أجاب عليها الشيخ محمد بن صالح العثيمين).

## بەرکەوتنی کەمێك خوێن بە پۆشاکەوە نوێژی بۆ دوبارە ناکرێتەوە

پ ٩٠/ گەر یەکێك نوێژی کردو خوێن بە جلەکەیەوە بوو، جا ئەو خوێنە چ خوێنی ئادەمیزاد بێت، یان ئاژەڵ، ئایا ئەو نوێژە بکاتەوە یان نا؟

وەڵام/ گەر خوێنەکە دڵۆپێك، یان دوو دڵۆپ، یان سێ دڵۆپی لە چەند شوێنێك بێت، ئەوا ئەو نوێژە دوبارە ناکاتەوە. بەڵام گەر دڵۆپە خوێنەکان زۆر بوون و لەپێش نوێژەکە نەیدەزانی، کە خوێنی بەرکەوتوە، ئەوکاتەی، کە لە نوێژەکە دەبێتەوە ئەوا لەسەری نیە نوێژەکە بکاتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە گەر لەپێش نوێژەکە دەیزانی خوێنی زۆر بە

جلەکەیەتی لەپێش نوێژدەکەدا، یان لەناو نوێژەکەدا ئەوا پێویستە نوێژەکە بکاتەوە.

(النخبة من الفتاوى النسائية، الشيخ العلامة، د.عبدالله بن عبدالرحمن الجبرين، الطبعة الأولى ١٤١٧هـ).

## ئافرەت تەنها هەست کردنی بە تەڕایی خۆشوشتنی ناکەوێتەسەر

پ٩١/ گەر ئافرەتێك لەخەو هەستاو بینی جلەکەی تەڕە، بەڵام نەزانێ کە ئەم تەڕاییە (مەزی)یە، یان شتی ترە. ئایا لەسەریەتی خۆی بشوات؟

وەڵام/ پێویست بە خۆشوشتن ناکات، بەڵکو تەنها دەستنوێژ هەڵبگرێت بۆ نوێژ، بەمەرجێك گەر ئیحتلامی نەبوبێت. چونکە گەر ئیحتلامی نەبوبێ دەکەوێتە گومانەوە، کە ئایا تەڕاییەکە (مذی)یە، یان شتی ترە کە لە ئەسڵدا ئەم حاڵەتە نەخۆشیە.

(نخبة من الفتاوى النسائية، د.عبدالله بن عبدالرحمن جبرين، ط١، ص١٢)

**پ ٩٢/ پێش (عادە) گەر دەرهاوێژ (ئیفرازات) لە لەشی ئافرەت هاتەدەر ئایا ئافرەت بۆی جائیزە نوێژ بکات؟**

وەڵام/ ئەو ئیفرازاتانەی، کە لەپێش (عادة) دێنەدەر، کە لەسەر شێوەی ئاو، یان خۆڵەمێشی، یان زەردایی، کە لە غەیری کاتی عادە خۆی دەنوێنێ، وادەبینم، کە نابێتە هۆی نوێژنەکردنی، چونکە ئەو ئاوە حەیز نیەو لەپێش کاتی حەیز هاتۆتە دەرەوە. بەڵام گەر بە بەردەوامی بێت، ئەوا لەسەر ئافرەتەکەیە، کە بۆ هەر نوێژێك دەستنوێژ هەڵبگرێتو حوکمەکەی وەکو حوکمی میزە چرکەیە، گەر لەکاتی نوێژدا هاتەدەرەوە، با نوێژەکە تەواو بکاتو نەیبڕێ.

(نخبة من الفتاوى النسائية، ص١٤).

## جگە لە ڕێی کۆم، جائیزە پیاو لە دواوە چێژ لە ژنەکەی وەربگرێت

**پ ٩٤/ گەر پیاو لەدواوە بچێتە لای خێزانەکەی بەڵام بەبێ ئەوەی لە ڕێی کۆمەوە بێت، ئایا حوکمی ئەمەچیە؟**

وەڵام/ حەرامە پیاو لە ڕێی کۆمەوە لەگەڵ خێزانەکەی جووت ببێت. بەڵام جائیزە بۆ پیاو بەتایبەتی لەکاتێ، کە خێزانەکەی لە حەیزدایە، یان زەیستانە ئامێری خۆی بخاتە نێوان ڕانی هاوسەرەکەی، بۆ ئەوەی چێژ وەربگرێت، با لە دواوەش بێت.

(نخبة من فتاوى النسائية، ص٧١).

## ژن بۆی جائیزە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو نەهێڵێ منداڵی ببێ

پ ٩٥/ ئافرەتێک دەڵێ شەش منداڵم هەیە، زۆربەیان کاتێک لەدایک بوون، کە هێشتا منداڵەکەی پێشو شیری دووساڵەی تەواو نەکردووە. جا دەمەوێ لولەی منداڵ نەبوون بەکاربهێنم کە بۆ ماوەی دووساڵ نایەڵێ حەمل دروست ببێت، ئایا حوکمی شەرع چیە؟

وەڵام/ گەر ژنو مێرد پێکەوە ڕازی بن قەیناکەو جائیزە، گەر دڵنیابن لەوەی، کە ئەم لولەیە زیانی بۆ منداڵدان نیەو نابێتە هۆی منداڵ نەبونی یەکجارەکی.

(النخبة من الفتاوى النسائية، ص١٢٠).

## سەرپۆش دەبێ سینگ و بەرۆك دابپۆشێ

پ ٩٦/ زۆر لە ئافرەتان دەبینرێ کە سەرپۆش دەپۆشن، بەڵام بەسەر سنگیان داناهێننە خوارەوە، بەڵکە بە گەردنیانەوە دەبەستن، یان بەملاولای پشت شانیان دێننە خوارەوە. ئایا ئەم جۆرە سەرپۆشە جائیزە؟!.

وەڵام/ ئەم دیاردە ناشەرعییە لەناو زۆر لە ئافرەتی سەرپۆش بەسەر بڵاوە، کە بۆ جوانیی دەیکەن، بە تایبەتی ئافرەتە بێژەرەکانی کەناڵە ئیسلامیەکان ئەمە دەکەن و، دەبنە پێشەنگیەکی خراپ بۆ ئافرەتانی تر، ئەمەش بەهیچ شێوەیەك جائیز نیەو پێچەوانەی دەقی قورئانە کە دەفەرموێ: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ (النور- ٣١)، واتە: با ئافرەتە مسوڵمانەکان سەرپۆشەکانیان بەسەر سینگ و بەرۆکیاندا بێننە خوارەوە.

دیاره ئەمجۆره ئافرەتانه یان مەرجی شەرعی حیجاب نازانن، یان دەزانن‌و بە مەبەست ئەم کاره دەکەن، تاسەرنجی پیاوان بۆخۆیان ڕابکێشن. چونکه بەمجۆره سەرپۆش پۆشینه، کە لە گەردنیان دەنالێنن‌و سینگیان بە ڕووتی، یان مەمکیان بەمجەسەمی بەدەردەخەن، کە ئەمەش دەبێته هۆی ڕوانینی حەرام لەلایەن پیاوانەوە، کە حەرامه، جا با ئەو ئافرەتانه لە خوا بترسن‌و نەبنە مایەی گوناهـو تاوان. سەرپۆش پۆشین دەبێ بەوشێوه بێ، کە خواو پێغەمبەر فەرمانیان کردوه، تا پاداشتی لەسەر وەدەست بهێنرێ. ئەگینا بەپێچەوانەوە دەبێته مایەی گوناهوتاوان، چونکه فەرمانی خوا دەشێوێنێ‌و ناشیرینی دەکات. هەروەها ئەو ئافرەتانه لە ماندووبون زیاتر هیچیان بۆ نامێنێتەوە.

## ئافرەت بۆی جائیزە حەبی مەنعی عادە بۆ حەج و ڕەمەزان بەکاربهێنێ

پ ٩٧/ ئایا ئافرەت بۆی جائیزە حەبی مەنعی عادە بەکاربهێنێ لەکاتی حەج یان لەکاتی ڕەمەزاندا؟

وەڵام/ بەڵێ، ئافرەت بۆی جائیزە حەبی مەنعی خوێنی حەیز بەکاربهێنێ لەکاتی حەجدا. ئەمەش دوای ئەوەی، کە پزیشک ئامازە بە دروستی بکات، هەروەها دەتوانێ لە ڕەمەزان بەکاری بهێنێ بۆ ئەوەی بتوانێ بەڕۆژوو بێ.

(فتاوى المرأة، الجزء الأول والثاني أجاب عليها اللجنة الدائمة للافتاء، ص١٦٠).

## بە گومان دەستنوێژ بەتاڵ نابێتەوە

**پ ٩٨/ گەر یەکێك کەوتە گومان (شك)، کە ئایا دەستنوێژی بەتاڵ بۆتەوە یان نا، ئایا حوکمی ئەمەچیە؟**

وەڵام/ گەریەکێك کەوتە گومان، کە ئایا دەستنوێژی شکاوە یان نا؟ ئەسڵ ئەوەیە، کە دەستنوێژی نەشکاوەو، گومان (شك) هیچ زیانی نیە. لە پێغەمبەر ﷺ پرسیارکرا سەبارەت بە پیاوێك، کە لە نوێژدا هەست بە شتێك دەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: **((لا ينصرف حتى سمع صوتا او يجد ريحا))**، واتە: با لە نوێژەکەی دەرنەچێت، تا ئەوکاتەی، کە گوێی لە دەنگی بایەکە بێت، یان بۆنی بێت. پێغەمبەر خوا ﷺ ئەوەی بەدەرخست، کە ئەصڵ ئەوەیە دەستنوێژی هەیە، تا ئەوکاتەی دڵنیا دەبێت، کە دەستنوێژی نەماوە. جا مادام گومانی لە دەستنوێژەکەی هەیە، ئەوا دەستنوێژەکەی بەتاڵ نەبۆتەوە. (فتاوى المراة، اجاب عليها الشيخ بن باز، ص١٣٤).

## پ ٩٩/ ئايا پياو بۆى جائيزە بە مارەيى كچەكەى يان خوشكەكەى ژن مارە بكات؟

وەڵام/ مارەيى مافێكە لەمافەكانى كچ،يان خوشك، بەشێكە لە موڵكەكانى، جاگەر بە ئارەزووى خۆىو بەبێ زۆر لێكردن بيدات بە باوك، يان برا، يان بەشێك لە مارەييەكەى پێ ببەخشێت، ئەوا بۆى جائيزە. بەڵام گەر ئافرەتەكە پێى خۆش نەبوو پێى ببەخشێ، ئەوا بۆ پياو جائيز نيە لێى بستێنێ، تەنانەت گەر كەمكێش بێ، چونكە ئەم مارەييە لە تايبەتمەنديەكانى كچەكەيەو، هيچ كەسێكى تر مافى تێدا نيە.

(فتاوى المرأة، اجاب عليهااللجنة الدائمة للافتاء، ص١٧٥).

تێبينى:- پێش مارەكردن نابێو جائيز نيە مەرجى دانانى بەشێك لە مارەيى بە باوك يان بە برا بخرێتە ناو عەقدى مارەييەكە.

## گەر لە برسان بمری نابێ
## بەهۆی زیناوە خۆت تێر بکەی

پ ١٠٠/ گەر ئافرەت زۆر برسی بوو یان زۆر تینوو بوو، هیچ شتێکی دەست نەدەکەوت بیخواو بیخواتەوە لەوەش دەترسا، کە نەخواو نەخواتەوە بمرێو هیچ رێگایەك نیە تەنها بەزینا دەستی دەکەوت، ئایا بۆی جائیزە زینا بکات؟

وەڵام/ محب الطبراني، کە یەکێکە لە شافعییەکان گوتویەتی: ئافرەت بۆی جائیز نیە زینا بکات بەپێچەوانەی ئەوەی، کە گۆشتی مردوی بۆ جائیزە لە حاڵەتی ناچاریدا بیخوات بۆ ئەوەی پێی بژیێ؟

(المفصل في احكام المرأة، د.عبدالكريم زيدان، ج٣، ص٨٠).

## ئافرەتی مێرددار بۆی جائیزە دەرمانی بەهێزکردنی جنسی بەکاربهێنێ

**پ ١٠١/ ئافرەتی مێرددار گەر ئارەزوی جنسیی لاوازو کز بوو، ئایا بۆی جائیزە دەرمان بەکاربهێنێ بۆ بەهێز کردنی جنسی؟**

**وەڵام/ ئافرەتی مێرددار، گەر بەهۆی نەخۆشییەك ئارەزوی جیماعی کز بوو، یان هەرهۆیەکی تر، بۆی جائیزە دەرمان بەکاربهێنی بۆ بەهێزکردنی ئارەزوی جیماع کردن، بۆ ئەوەی ژیانی هاوسەرێتی بە بەختەوەری بەسەر ببات. بەڵام گەر ئافرەت شوی نەکردبوو، بۆی جائیز نییە ئەو جۆرە دەرمانە بەکاربهێنێ.**

(المفصل في احكام المرأة، الجزء الثالث، ص١٠٤).

## دەبێ بۆ پیاوی بێگانە ئافرەت هەردو پێی دابپۆشێ

**پ.١٠٢/ ئایا هەردوو پێیەکانی ئافرەت دەبێ دابپۆشرێ؟**

وەڵام/ ڕای پەسەند ئەوەیە، کە پێویستە دابپۆشرێو بەدیارنەخرێ بۆ پیاوی بێگانە. مەگەر لەکاتی پێویستی بێت، وەك ئەوەی ئافرەت بە پێخاوسی بڕواتو ئەو ئافرەتە فەقیرەی، کە هیچ شتێکی نیە لەپێی بکات.

(المفصل في احكام المراة، الجزء الثالث، ص٢٠٠).

## بەبێ ئارەزوو جائیزە ئافرەت تەماشای پیاو بکات

**پ ١٠٣/ ئایا جائیزە ئافرەت تەماشای پیاوی بێگانە بکات؟**

وەڵام/ ڕای پەسەند سەبارەت بە تەماشاکردنی ئافرەت بۆ پیاو ئەوەیە، کە بۆ ئافرەت جائیزە تەماشای لەشی پیاو بکات، جگە لە نێوان

ناوك‌و چۆكی، بەلام بەمەرجێك نەبێتە مایەی وروژاندنی جنسی‌و لەفیتنە ئەمین بێ، ئەمەش وتەی حەنەفییەكان‌و ڕای پەسەند لەلای حەنبەلییەكان‌و یەكێك لە وتەكانی شافیعییەكانە.

(المفصل في احكام المرأة، الجزء الثالث، ص٢٣٠).

پ ١٠٤/ گەر ئافرەت پێش هاتنی خوێنی حەیز جۆرێك لە ئاوی زەرد، یان ڕەنگ لێڵ، هەندێ جار ڕەنگی سوری بێتەدەر، چۆن نوێژ بكات؟

وەلام/ ئەم جۆرە ئاوە، یان خوێنە، خوێنی پیسەو نابێتە هۆی نوێژ نەكردن. پێویستە لەسەر ئافرەتەكە فەرجی بشوات‌و بە پەڕۆیەك دایپۆشێ‌و بۆ هەر نوێژێك دەستنوێژ هەلبگرێ، مەگەر دلنیابێ لە دەرنەچونی هیچ شتێك لە نێوان كاتی نوێژەكاندا، كە ئەوكاتە پێویستە بە دەستنوێژ هەلگرتنەوە ناكات.

**پ ١٠٥/ گەر یەكێك پێنج جارشیری ئافرەتێكی لەگەڵ كچێكیانی خواردبوو، ئایا براو خوشكەكانی دەبنە براو خوشكی؟**

وەڵام/ ئەو ئافرەتەی، كە شیر دەدات بەو كوڕە، دەبێتە دایكیو، مێردی ئافرەتەكەش دەبێتە باوكی ئەوكوڕە. كوڕو كچەكانیشی دەبن بە خوشكو برای ئەوكوڕە، بەڵام برای كوڕە شیر خواردووەكە نابێتە برای كچو كوڕی ئافرەتە شیردەرەكە. (هەمان سەرچاوە، ص٧٥).

## دەنگی ئافرەت بۆ قسەكردنی ئاسایی، حەڕام نیە

**پ ١٠٦/ ئایا دەنگی ئافرەت حەڕامە؟**

وەڵام/ دەنگی ئافرەت حەڕام نیە، ئەمەش وتەی شافعییەكانە، كە گوتویانە: (وصوت المرأة لیس بعورة)، هەروا وتەی مالكییەكانە (صوت المرأة

لیس بعورة حقیقیة)، وتەی حەنەفییەکانە (وصوتها لیس بعورة علی القول الراجح).

ئیمام غەزالی (رەحمەتی خوای لێبێ) گوتویەتی: دەنگی ئافرەت عەورەت نیە. بەڵام نەك لە گۆرانی وتندا، چونکە ئافرەتان لە سەردەمی صەحابە قسەیان کردووە لەگەڵ پیاوان، چ بە سەلام کردن، یان فەتوا وەرگرتنو پرسیارکردنو راوێژکردن. دەنگی ئافرەت کاتێك عەورەتو حەرامە، کە دەنگی بەرزبکاتەوە بۆ چێژ وەرگرتن گوێی لێ بگیرێ، چونکە دەبێتە مایەی ئارەزوو بزواندن.

(المفصل في احکام المرأة، الجزء الثالث، ص٢٧٩).

## بەبێ هۆ جائیز نیە ژن
## حەبی منداڵ نەبون بەکاربهێنێ

**پ ١٠٧/ ئایا جائیزە ئافرەت حەبی منداڵ نەبوون (منع الحمل) بەکاربهێنێ؟**

وەڵام/ ئافرەت بۆی جائیز نیە حەبی منداڵ نەبون بەکاربهێنێ لەبەرئەوەی، کە حەزی لە منداڵ نیە، یان لە ترسی ئەوەی نەتوانێ نەفەقەی منداڵەکان بدات.

بەڵام جائیزە ئافرەت حەبی منداڵ نەبون بەکاربهێنێ، گەر نەخۆشبێ، کە بە هۆی حەملەکەی زیانی پێبگات، یان لەبەرئەوەی منداڵی بە ئاسانی نابێو پێویستی بە نەشتەرگەری دەبێ لەکاتی منداڵ بوندا. هەروەها بۆ کاتی زەرورەت. لەمجۆرە حاڵەتانەدا بۆی هەیە حەبی منداڵ نەبون بەکاربهێنێ، بەمەرجێك پزیشك بڵێت، ئەم حەبە زیانی پێ ناگەیەنێ.

(فتاوى المراة، الجزء الثاني، اجاب عليها اللجنة الدائمة للافتاء، ص١٦٧).

## نیەت هێنان بە دڵە، نەك بە زمان

پ ١٠٨/ حوكمی نییەت بە زمان لە نوێژو دەستنوێژدا چیە؟

وەڵام/ حوكمەكەی (بیدعە)یە، چونكە نە پێغەمبەر ﷺ و نە صەحابەكان بە زمان نیەتیان نەهێناوە. نییەت شوێنەكەی دڵەو پێویست بەوە ناكات بە زمان بگوترێ.

(فتاوى المراة، الجزء الثاني،اجاب عليها الشيخ بن باز،ص١٢٢)

## ژن بۆی جائیزە ماڵو سامانی خۆی بەبێ ئیزنی مێردەكەی ببەخشێت

پ ١٠٩/ گەر ئافرەت ماڵو سامانی هەبوو، ئایا بۆی جائیزە بەبێ ئیزنی مێردەكەی ماڵو سامانی ببەخشێ؟

وەڵام/ جمهوری فوقەها یەك دەنگن، كە ئافرەت بۆی جائیزە ماڵو سامانی خۆی بەبێ ئیزنی مێردەكەی ببەخشێو بیكاتە صەدەقە. بەڵام

هەندێ لە فوقەها بە جائیزی دانانێن ئافرەت بەبێ ئیزنی مێردەکەی ماڵی خۆی ببەخشێ.

ڕای پەسەند (الراجح) وتەی جمهوری فوقەهایە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشەدا وا باشە ئافرەت لەماڵ بەخشینیدا ڕاوێژ بە مێردەکەی بکات، چونکە ڕاوێژکردن بە مێردەکەی ڕێز گرتنیەتیو خۆشەویستی لە نێوانیان زیاد دەکات.

(المفصل في احكام المرأة، الجزء الرابع، ص٢٩٢).

## شەترەنج تەنها بەلای شافیعییەکان جائیزە

پ ١١٠/ ئایا یاری شەترەنج حەرامە؟

وەڵام/ شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە وتویەتی: یاری شەترەنج لەلای جەماوەری زانایانی ئوممەت حەرامە وەکو (تاوڵە). ئەم یارییە وەکو تاوڵە وایە لە حەرامیدا. یاری تاوڵە دوپاتی حەرامی لەسەر کراوە، چونکە دەقی حەرامی لەسەر هاتوە. بەڵام یاری شەترەنج حوکمەکەی بە قیاس لە دەقی حەرامییەتی تاوڵەوە

وەردەگیرێ، ئەمەش مەزهەبی حەنبەلییەکانـە. عەلی کوڕی ئـەبو تالیـبو ئـیبن عومـەرو ئـیبن عەبباسو سەعیدی کوڕی موسـەیبو قاسـمو سـالمو عـەروەو محمـدی کـوڕی عـەلی کـوڕی حسـینو ئیمـام مالـك بۆچـونیان وایـە کـە شـەترەنج حەرامـە، ئەمـەش وتـەی ئـەبو حەنیفەیە، بەڵام بۆچونی شافیعییەکان ئەوەیە کە شەترەنج جائیزە، بەڵام ئیمام نـەوەوی، کـە شافیعی مەزهەبە وتویەتی: (یاری شەترەنج لـە مەزهەبەکەماندا مەکروهەو حەرام نیە).

(المفصل في احكام المرأة، الجزء الرابع، ص١١٢).

## ژن مارەکردن بە نیەتی ماوەیەکی کاتی، یان تەڵاقدان حەڕامە

**پ ١١١/ گەر پیاو ژن بهێنێ و نییەتی تەڵاقی هەبێ، ئایا عەقدی ئەو زەواجە (صحیح)ە؟**

وەڵام/ شەرع ناسان (الفقهاء) هاودەنگن لەسەر ئەوەی، گەر پیاو ژن مارەبڕ بکات، بێئەوەی لە عەقدەکەدا کات دیاری بکاتو لە نییەتی دابێت دوای ماوەیەك تەڵاقی دەدات، یان پاش تەواوبوونی کاروباری لەو شارەی، کە تیایدا ماوەتەو نییەتی تەڵاقی هەبێت، ئەوا ئەو زەواجە (صحیح)ە. بەڵام (ئەوزاعی) پێچەوانەی ڕای فوقەهایەو ئەوجۆرە زەواجەی بە (زواج المتعة) داناوە، کە (زواج المتعة) بە یەکدەنگی حەڕامە.

خاوەنی تەفسیری (المنار) شێخ ڕەشید ڕەزا گوتویەوتی: توندوتیژی زاناکانی سەلەفو خەلەف سەبارەت بە حەرامی (زواج المتعة) ئەوە دەخوازێو پێویست دەکات، کە مارەبڕین بە

نییەتی تەڵاق قەدەغە بێت. واتە حەرام بێت. هەرچەندە شەرع ناسان دەڵێن: عەقدی مارەبڕینەکە (صحیح) دەبێت، گەر پیاو نییەتی (توقیت)ی هەبێت، بەڵام لە صیغەی عەقدەکە بە مەرج دانەنرابێت، بەڵام شاردنەوەی ئەم نییەتەی دەبێتە فێڵ و گزی، کە ئەمە شایانترە ببێتە بەتاڵبونەوەی عەقدەکە، بەتاڵبونەوەی ئەو عەقدەی، کە مەرجی (توقیت)ی تێدایە، کە بە ڕەزامەندی پیاوو ژنوو وەلیەکەی بێت ئەم فێڵ و گزییەش خراپەی تری بەدوادا دێت، وەکو دژایەتیو بوغزاندنو نەمانی متمانە، تەنانەت بەو پیاوانەش، کە دەیانەوێ بەڕاستی بڕیاری هاوسەرێتی بدەن.

(فقه السنة، المجلد الثاني، ص١٧٥، طبعة خاصة بشركة منار الدولية).

## زەواجی موتعە (سیغە) حەڕامە

**پ ١١٢/ زەواجی موتعە چیە؟ ئایا حەرامە یان حەلاڵە؟**

وەڵام/ زەواجی موتعە ئەوەیە، کە پیاو ژن مارەبڕ بکات بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە مارەییەکی دیاریکراو. ئەو ماوەیەش بە ڕەزامەندی هەردوکیانە، جا چ ماوەیەکە درێژ بێت، یان کورت، وەکو ساڵێك، یان مانگ‌و ڕۆژ. ئەم زەواجە ناوی تریشی هەیە. لەلای جەعفەرییەکان، کە بە لایانەوە حەڵاڵە وەکو (الزواج الدائم)(الزواج المنطق)و (زواج المغبطة).

زەواجی موتعە بە گوتەی فوقەهای مسوڵمانان، جگە لە جەعفەرییەکان بە هەموو جۆرە تەعبیرە جیاجیاکانیدا بەتاڵەو حەڕامە.

شەرعناسی ناسراو (ابن رشد) گوتویەتی؛ (نیکاحی موتعە بە هاودەنگی هەموو فوقەهای (امصار) بە حەڕام دانراوە. خاوەنی کتێبی (الهدایة) لە فیقهی حەنەفی گوتویەتی: (نیکاحی

موتعه –باطل–ە نیکاحی موتعه ئەوەیە، کە پیاو بە ئافرەت بڵێ: (أتمتع بك كذا مدة بكذا من المال) بۆ ماوەی ئەوەندەو بەوەندە پارە، چێژت لێ وەردەگرمو لەگەڵت ڕادەبوێرم)..

هەروەها خاوەنی (المهذب)ی فیقهی شافیعی گوتویەتی: (ولا يجوز نكاح المتعة) نیکاحی موتعە جائیز نیە. بەڵگەش لەسەر حەڕامیی زەواجی موتعە ئەمانەن:

جمهوری فوقەها گوتویانە: پێغەمبەر ﷺ وەکو ڕوخسەتێك ڕێگەی دا بە زەواجی موتعە، پاشان قەدەغەی کردو بە حەڕامی دانا. ئەم قەدەغەکردنەش، تا کاتی کۆچی دوایی پێغەمبەر جێگیر بوو، ئەمەش کورتەیەك لە سوننەتی پێغەمبەرە سەبارەت بە زەواجی موتعە:

یەکەم: عن علي بن ابي طالب ﷺ ان رسول الله ﷺ نهى عن نكاح المتعة وعن لحوم الحمر الاهلية يوم خيبر وفي رواية: نهى عن متعة النساء يوم خيبر، وعن لحوم الحمر الانسية. (متفق عليه).

دووەم: عن الربيع بن سبرة، عن ابيه ان رسول الله ﷺ نهى يوم الفتح فتح مكة- عن متعة النساء. اخرجه مسلم في صحيحه.

له ڕیوایەتێكی تری مسلم دا عن الربيع بن سبرة، عن ابيه حدثه انه كان مع رسول الله ﷺ وقال: **((يا ايها الناس اني قد كنت آذنت لكم في الإستمتاع من النساء، وإن الله قد حرم ذلكم الى يوم القيامة، فمن كان عنده منهن شيء فليخل سبيله ولا تأخذوا مما آتيتموهن شيئا))**.

ئیمام نەوەوی له ڕاڤەی فەرموودەكانی ڕێگەدان بە موتعەو حەرامكردنی، هەندێ لە صحابە زەواجی موتعەیان كردووە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺو، لە سەردەمی ئەبوبەكرو ماوەیەك لە خەلافەتی عومەری كوڕی خەتتاب، گوتویەتی: ئەوەی ڕاست بێت ئەومیە، كە حەرامكردنو ڕێگەپێدانی زەواجی موتعە دوجار بووە. زەواجی موتعە لە پێش جەنگی خەیبەر حەلاڵ بووە، پاشان لە ڕۆژی خەیبەر حەرام كرا، پاشان لە ڕۆژی ڕزگاركردن (فتح)ی مەككە

ڕێگەی پێدرا، پاشان دوای سێ ڕۆژ حەرام کرا بە هەمیشەیی، تا ڕۆژی قیامەتو حەڕامییەکەی جێگیر بوو.

بەڵام سەبارەت بەوانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەرو خەلافەتی ئەبوبەکری سدیق و ماوەیەك لە خەلافەتی عومەری کوڕی خەتتاب زەواجی موتعەیان کردووە، ئەوا ئەو کەسانە نەیانزانییوە، کە زەواجی موتعە (نسخ) بۆتەوە.

(المفصل في احكام المرأة، د.عبدالكريم زيدان، الجزء السادس، ص١٦٢-١٦٥).

## مارە بەجاش حەڕامە

پ ١١٣/ ئایا مارە بەجاش حەڕامە؟

وەڵام/ ئەم جۆرە مارەییە لە شەرعدا پێی دەڵێن (نكاح المحلل)، مارەبەجاش، یان (نكاح المحلل) ئەوەیە، گەر پیاوێك هەرسێ تەڵاقی ژنەکەی دابێتو، پیاوێکی تر ئەو ژنەیە مارەبکات بەمەبەستی تەڵاقدانەوەی بۆ پیاوی یەکەم.

کەوا پیاوی یەکەم لە عەقدی مارەییەکەی مەرج لەسەر پیاوی دووەم دادەنێ، دوای دخول پێکردنی بۆی تەڵاق بداتەوە. ئەم جۆرە مارەکردنە کاتی (مؤقت)ە، چونکە مارەکردنی (متعە)ش هەر بۆ ماوەیەکەو کاتییە، کە حەرامە، بەڵام گەر ئافرەتێك سێ بەسێ تەڵاق درابێو پاشان پیاوێك بە ئارەزوی خۆی مارەی بکات بەبێ هیچ مەرجێك لەلایەن پیاوی یەکەمەوەو، پاشان تەڵاقی ئاسایی بدات بەهەر هۆیەك بێت، یان بمرێتو، پاشان عیدەی تەواو بێت، ئەوا پیاوی یەکەم بۆی جائیزە مارەی بکاتەوە بە مارەییەکی نوێ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾ (البقرة-۲۳۰).

مەبەست لە (طلقها) تەڵاقی سێ بەسێیە، هەروەها لە سوننەتی پێغەمبەرەوە هاتوە: (ان

رفاعة القرظي تزوج إمراة، ثم طلقها فتزوجت آخر، فأتت النبي ﷺ فذكرت له انه لايأتيها، وانه ليس معه الا مثل هدبة، فقال ﷺ: لا، حتى تذوقي عسيلته ويذوق عسيلتك... ڕەفاعەى قەرزى ژنێكى هێنا، پاشان تەڵاقیداو، ئەویش شوى بە پیاوێك كرد. ژنەكە چووە خزمەت پێغەمبەرو گوتى: پیاوەكە نایەتە لاى لەگەڵى جووت ببێ، ئەو پیاوە ئامێرى نەرمو شلە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: نەخێر، دەبێ تۆ چێژى لێوەربگرى، ئەویش چێژت لێ وەربگرێ-واتە: جیماعت لەگەڵدا بكات). (اخرجه البخاري في صحيح البخاري بشرح العسقلاني، ج٩٠، ص٤٦٤).

جا ئەوكەسەى مارەبەجاش بكات وەك، كە لەپێشەوە پێناسەیمان كرد ئەوا، وەبەر نەفرەتى خواى گەورە دەكەوێ. اخرج الامام الترمذي في (جامعة) عن جابر وعلي (رضي الله عنه)، قال: (إن رسول الله ﷺ لعن المحل والمحلل له)، واتە: پێغەمبەرى خوا نەفرەتى لەوكەسە كردووە، كە

ئافرەتێکی تەڵاقدراوی سێ بەسێ مارە بکاتەوە بە مەبەستی تەڵاقدانەوەی دوای دخول پێکردنی بۆ ئەوەی پیاوی یەکەم بە مارەییەکی نوێ مارەی بکاتەوە، هەروەها نەفرەتی لە پیاوی یەکەمیش کردووە.

خاوەنی کتێبی (سبل السلام) گوتویەتی: ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر حەرامی مارەبەجاش (التحليل)، چونکە (لعنة) لە کاری حەرام دەکرێت، هەموو حەرامکراوێك قەدەغەی لێکراوە، قەدەغەکردنەکەش عەقدەکە (فاسد) دەکات. (المفصل في احكام المرأة، الجزء السادس، الطبعة الثانية، ص١٩١-١٩٤).

## پۆشاکی ئافرەتان دەبێ بە پێی شەرع بێ

**پ ١١٤/ ئافرەتی واهەیە سەرپۆشەکەی بەسەر سینگیدا دێنێتە خوارەوە، بەڵام جلێکی پۆشیوە کە تەسکە، یان تەنکە، یان کورتە، یان پانتۆڵ لەبەردەکات و سەرپۆشێك دەپۆشی، جا ئایا ئەم جۆرە حیجاب و جلە پێی دەڵێن حیجابی شەرعی؟**

**وەڵام/ بەر لە هەموو شتێ، ئەو ئافرەتەی بڕیاری حیجاب پۆشین دەدات پێویستە ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی بێت و لە نییەتیدا جێگیر بێت، کە حیجابەکەی دەبێ بەپێی مەرجە سنوردارەکانی حیجابی شەرعی بێت، نەك بە ئارەزوی خودی ئافرەتەکە بێت و هەرچیەکی بوێ بەپێی مۆدێل لەبەری بکات.**

## مەرجەکانی حیجابی شەرعیش بەکورتی ئەمانەن:

١- حیجابو جلەکە هەموو ئەندامەکانی لەشی ئافرەتەکە دابپۆشێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الاحزاب- ٥٩).

٢- حیجابەکە نابێ ڕازاوەو ڕەنگاو ڕەنگو سەرنج ڕاکێشەر بێت، وەك ئێستا زۆر لە ئافرەتان حیجابی ڕەنگاو ڕەنگ دەپۆشن. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾(النور- ٣١).

٣- حیجابەکە نابێ بۆندار بکرێ ئەگینا، کە پێی دەچێتە دەرەوە وەك زینای کردبێ وایە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (أي إمراة إستعطرت ثم خرجت، فمرت على قوم ليجدوا ريحها فهي زانية) رواه الإمام احمد وغيره، باسناد صحيح الجامع، ٢٧٠١).

٤- حیجابەکە نابێ تەسك بێت، کە ئەندامی لەشی بەدەربخات. لە ئوسامەی کوڕی زیدەوە کە گوتەیەتی: پێغەمبەر جلێکی پێ بەخشیم، کە تەنك و تەسك بو، کە دوحیەی کەلبی بەدیاری پێشکەشی پێغەمبەری کردبوو، جا منیش بەخشیم بە خێزانەکەم.

پێغەمبەر ﷺ پێی گوتم: بۆ جلەکەت لەبەر نەکردووە، منیش گوتم ئەی پێغەمبەری خوا بەخشیومە بە خێزانەکەم بیپۆشی، پێغەمبەر فەرموی: بڕۆ بە خێزانەکەت بڵێ با بیکاتە ژێرکراس، لەبەرئەوەی دەترسم قەبارەی ئیسکەکانی بەدەربکەوێ، ئیمام ئەحمەد لە مسند ٢٠٥/٥ ڕیوایەتی کردووە.

٥- حیجابەکە دەبێ قوماشەکەی ئەستوور بێت و تەنك نەبێت. لە ئەبو هورەیرەوە، کە موسلیم لە (صحیح)دا ڕیوایەت دەکات کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((صنفان من أهل النار لم

**أرهما، قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون الناس، ونساء كاسيات عاريات مميلات مائلات، رؤسهن كأسنمة البخت المائلة لايدخلن الجنة ولا يجدن ريحها)).**

٦- حیجابەکە نابێ بە جلی پیاوان بچێ: لە ئیبن عەبباسەوە کە ئیمامی بوخاری لە (صحیح)یدا ڕیوایەتی دەکات، کە گوتویەتی: **((لعن رسول الله المتشبهين من الرجال بالنساء والمتشبهات من النساء بالرجال))** کەواتە: ئەو ئافرەتانەی کراسو پانتۆڵ لەبەردەکەنو سەرپۆش دەپۆشن وەبەر لەعنەتی پێغەمبەر دەکەون.

٧- حیجابەکە نابێ بۆ ناوبانگیو فێرکردنو خۆبەدەرخستن بێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((من لبس ثوب شهرة ألبسه الله يوم القيامة ثوبا مذلة ثم يلهب في النار))** رواه أبو داود وابن ماجة صحيح الجامع، ٢٠٢٦.

٨- نابێ بە جلو بەرگی کافران بچێ:

ئـــيبن عومـــەر (ڕەزای خوايـــان لێبـــێ) گوتويەتی كە پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمويەتی: ((مـن تشـبه بقـوم فهـو مـنهم)) (رواه ابـو داود وغيره).

(شروط حجاب المرأة المسلمة من القرآن والسنة، سلسلة كتاب الطريق الى الجنة، ٧-٨).

## پياو بۆی هەيە نەهێڵێ خێزانەكەی نوێژە سوننەتەكان بكات و ڕۆژوی سوننەت بگرێ

**پ ١١٥/ ئايـا پيـاو بـۆی هەيـە قەدەغـەی خێزانەكـەی بكـات لـە نوێـژە سـوننەكان و ڕۆژوی سوننەت و حەجی سوونەت؟**

وەڵام/ بـەڵێ، پيـاو بـۆی هەيـە قەدەغـەی خێزانەكـەی بكـات لـە عيبادەتـە سـوننەتەكان. بەڵگـەش فـەرمودەی پێغەمبـەری خوايـە (عـن ابـي هريـرة (رضـي الله عنهـا) ان رسـول الله ﷺ قال: ((لا يحل للمرأة أن تصوم وزوجها شاهد الا بإذنه)) صحيح البخاري، بشرح العسقلاني، ج٩، ص٤٩٣،

وفي رواية ((لا تصم امـراة وزوجها شاهد يوما من غير رمضان الأ بإذنه)). سنن ابي داود، ج٧، ص١٤٨، جامع الترمذي، ج٢، ص٤٩٥، سنن ابن ماجة، ج١، ص٥٦٠.

ئــەم فەرموودەيــە بەلگەيــە لەســەر حــەرامى رۆژوى سوننـەت (التطوع)ى ئافرەت بـەبێ ئيزنـى مێردەكەى. هۆى ئەم حەرامكردنەش ئەوەيە، كە پياو (مێرد) مـافى چێژ وەرگرتنـى بـەو هەيـە لـە هـەموو كاتێكـدا، مافەكەشـى يەكسـەر واجبـەو، ئافرەتەكە بۆى جائيز نيـە بـە سـەرقاڵبونى بـە سـوننەتەوە، ئـەو مافـەى بفـەوتێنێ. بـەلأم گـەر مێـردى ژنەكـە چـوو بـوو بـۆ سـەفەر، ئـەوا بـۆى جائيزە عيبادەتە سوننەتەكان جێبەجێ بكات.

(المفصل في احكام المرأة، ج٧، ص٢٨٧).

## لە شەش مانگ زیاتر نابێ لە خێزان بەدوربێ

پ ١١٦/ ئایا پیاو ماوەی چەندی بۆ جائیزە لە خێزانەکەی بەدور بێت کە جیماعی لەگەڵدا نەکات؟

وەڵام/ گەر پیاو چوو بووە سەفەر، ماوەی شەش مانگی بۆ جائیزە، کە لە خێزانەکەی دوور بێت و، لەسەری واجب دەبێت جیماعی لەگەڵدا بکات. ئەمەش بە حوکمی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێ)، کەوا ژن ناتوانێ لە پێنج شەش مانگ زیاتر ئارام لەسەر مێردەکەی بگرێ، کە جیماعی لەگەڵدا بکات. جا ئیمامی عومەر کاتی دانابوو بۆ موجاهیدان لە جەنگەکاندا، کە ماوەی شەش مانگ بوو، مانگێک بەڕێوەو چوار مانگ مانەوە لەلای خێزانەکانیان‌و، مانگێک بۆ گەڕانەوە.

(المفصل في احكام المراة، ج٧، ص١٢٤).

## مامەڵە باشی لەگەڵ خێزان

**پ ١١٧/ خـوای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا دەفـــــــەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ (النساء- ١٩) مەبەست لەم ئایەتە چیە؟**

**وەڵام/** لـە تەفسـیری (ابـن کـثیر)دا هـاتووە، کـە ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾، بـــەواتای: لەگـــەڵ خێزانەکانتانـدا قسەخۆش‌وکـردەوە بـاش‌بن‌و بەپێی توانا خۆتان ڕێك بکەن وەك، کە پێتـان خۆشـە ئـەوان بـۆ ئێـوەش بەهـەمان شـێوە خۆتانیان بۆ ڕێك بکەن.

لـە (احکام القـرآن)ی (جصـاص)دا هـاتووە، کـە خـوای گـەورەی فـەرمانی بـە پیـاوان کـردووە، بەباشی ڕەفتار لەگەڵ خێزانەکانیانـدا بکـەن، کە مافی خۆی بـداتێ وەکو مـارەیی‌و نەفەقەو نـۆرە مانــەوە لــە نێــوان خێزانــەکانیان، ئازارنــەدانی ئــافرەت بـــە وتـــەی ڕەق‌و ناشـــیرین و پشـــت تـــێکردنی‌و مەیلـدانی بـۆ غـەیری ئـەو دەم‌و

چاوگرژی.

لە (احكام القرآن)ی (قرطبي)دا هاتووە، کە واتای: بەوشێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن، کە خوای گەورە فەرمانی داوە، ئەوەش بەجێگەیاندنی مارەییو نەفەقەو گرژی نەنواندن بەرەو ڕوی خێزانەکەیو قسە ڕەق نەبێت.

(المفصل في احكام المرأة، ج٧، ص٢٢٥).

## چونە لای خێزان لە ڕێی کۆمەوە حەرامە

**پ ١١٨/ گەر پیاو ویستی لەدواوە بەڕێی کۆمەوە جیماع لەگەڵ خێزانەکەی بکات ئایا خێزانەکەی چی بکات؟**

وەڵام/ چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە، کە بەلگەی حەرامیی چونە لای خێزان لە پشتەوە لە ڕێی کۆمەوە دەدەن، کە نەفرەت لەوکەسە دەکات ئەم کارە دەکات وەك دەفەرموێ:

* ((ولا تأتوا النساء في ادبارهن)) (جامع الترمذي، ج، ٤٢٢٧).
* ((ملعون من أتى إمراة في دبرها)) (سنن ابي داود، ج٦، ص١٩٨).
* ((إن الله لايستحي من الحق وقالها ثلاث مرات لا تأتوا النساء في ادبارهن)). (سنن الدرامي، ج٢، ص١٤٥،سنن ابن ماجه، ج١، ص٦١٩).
* ((لاينظر الله الرجل جامع إمراته في دبرها)). (سنن ابن ماجه، ج١، ص٦١٩).

جا گەر پیاو داوای لە خێزانەکەی کرد لە دواوە جیماعی لەگەڵدا بکات لەڕێی کۆمەوە، ئەوا لەسەر خێزانەکەیەتی، کە قەدەغەی بکات. چونکە ئەم داوایەو ئەم کارە، تاوان و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەیەتی، پێغەمبەریش دەفەرموێ: ((لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق))، واتە: فەمارنبەری بۆ هیچ کەسێك نیە، کە لە سەرپێچی خوای گەورەدا بێت.

(المفصل في احكام المرأة، ج٧، ص٢٨٤).

## ئەو ژنە نەفرەت لێکراوە، کە بەدەم داوای مێردەکەیەوە ناچێت

**پ ١١٩/ گەر پیاو داوای سەرجێیی (جماع)ی لە خێزانەکەی کرد، خێزانەکەی بەدەم داواکەی نەچوو و قەدەغەی کرد، ئایا ئەو ئافرەتە تاوانبارە، حوکمەکەشی چیە؟**

**وەڵام/** بەڵێ، تاوانبارە، پێویستە ئافرەت بزانێ پیاو بەرامبەر ئارەزوی جنسی لاوازو خۆنەگرە، بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا، کە بەڕەڵڵایی ئافرەتو نیومڕووتیو خۆسفورکردنی، کەشێکی لەباری دروست کردووە بۆ وروژاندنی جنسی پیاو، پیاوی موسوڵمانیش شوێنی شەرعی خۆی بۆ دیاریکراوە بۆ جێبەجێکردنی کارە جنسیەکەی، کە هاوسەرەکەیەتی. ئەوەتا پێغەمبەر خوا ﷺ دەفەرموێ: **((اذا رای احدکم إمراة، فوقعت في قلبه، فليعمد الى إمرأته فليواقعها فان ذلك يرد

**ما في قلبه))** رواه مسلم، واتـە: ئەگـەر يـەكێك لـە ئێـوە ئـافرەتێكى بينـىو كەوتـە دڵيـەوە، بـا بچـێتەوە ماڵـەوە لەگـەڵ هاوسـەرەكەى جـووت ببـێ، چـونكە بەمـە دڵـى دادەمركێتـەوە. هـەر ئـافرەتێكيش قەدەغـەى مێردەكـەى بكـات لـە جوتبوون، ئەوا تا بەيانى دەكاتـەوە فريشـتەكان لەعنـــەتى لـــێدەدەن، وەك پێغەمبـــەر ﷺ دەفـەرموێ: **((اذا دعـا الرجـل إمراتـه فأبـت أن تجيء لعنتها الملائكة حتى تصبح))** اخرجه البخاري في صحيحه، هـەروا دەفـەرموێ: **((اذا دعـا الرجـل إمراته الى فرشه فلـم تأتـه فبـات غضبان عليها لعنتها الملائكة حتى تصبح))** متفق عليه.

لـەم فەرمودەيـەدا دەفـەرموێ: گـەر پيـاو لـە هاوسەرەكەى تورەبێ بەهۆى بەدەمـەوە نـەهاتنى بـۆ جوتبـون، فريشـتەكان تـا بـەيانى لەعنـەتى لـێدەدەن.

ئيبن حـەزم بـە فـەرزى دانـاوە ژن بـەدەم داواى مێردەكەيـەوە بچـێت بـۆ جيمـاع كـردن، گـەر

بەدەمیــەوە نەچێت، ئــەوا شایسـتەی لەعنەتــە، وەك دەفەرموێ: (لەسەر ئافرەت فەرزە قەدەغەی مێردەکـەی نـەکات بـۆ جوتبـون، جـا هـەرکاتێك داوای لێکردو ئافرەتەکە لە حەیزدا، یان نـەخۆش نــەبوو، کــە بــە هــۆی نەخۆشــیەکەوە ئــازاری پێبگـات، یــان بــەڕۆژوو نــەبوو، بــەبێ عــوزر سەرجێیی لەگەڵدا نەکرد، ئەوا ئەو ئافرەتـە لـە ڕەحمەتی خوا بێبەش‌و دەرکراو"ملعون"ە).

کەواتــــە بـــا ئافرەتـــان ئاگـــادارbن‌و بەســـەر دەرونیانــدا زاڵــبن‌و ئــەم مەســەلەیە بــە گــرنگ وەربگــرن، چــونکە ئەمــە کــارێکی زۆر هەســتیارو ترسـناکە، گـەر ئافرەتەکـە لەسـەر تەنـدوری نـان کردن بێت، دەبێ ملکەچ بێـت بـۆ ئـەم کـارە، وەك پێغەمبــەر ﷺ دەفــەرموێ: **((إذا دعــا الرجــل زوجته لحاجته فلتأته وإن كانت على التنور))** رواه النســائي والترمــذي (صــحيح) هــەروەها دەفــەرموێ: **((والذي نفسي بيده ما من رجل يدعوا إمرأته الى فراشه فتأبى عليه إلا كان الذي في السماء ساخطا عليها حتى يرضى عنها))** رواه البخاري ومسلم، واتە:

سوێند، بەوەی گیانمی بەدەستە هەرپیاوێك داوای جیماع لە ژنەکەی بکات، ژنەکەی بەدەمیەوە نەچێتو قەدەغەی بکات، ئەوا خوای گەورە لێی تورەیە، تا ئەوکاتەی مێردەکەی لێی ڕازی دەبێت.
(المفصل في احكام المرأة، د.عبدالكريم زيدان، تحفة العروس، واجبات المرأة المسلمة).

## بەرامبەر پیاوی نابینا سەر دانە پۆشریٚ

پ ١٢٠/ ئایا ئافرەت پێویستە بەرامبەر پیاوی نابینا (کوێر) خۆی دابپۆشیٚ؟

وەڵام/ ئافرەت پێویست ناکات بەرامبەر پیاوی نابینا خۆی دابپۆشیٚ. پێغەمبەری خوا فەرمانی بە فاتیمەی کردووە لەلای ئیبن مەکتوم بیٚ، فەرموی ئەوە پیاوێکی نابینایە، گەر پۆشاکەکەشت دابنیٚی ناتبینیٚ. (اخرجه مسلم في صحيحه). ئەو فەرمودەیەی، کە مەشهورو باوە لەناو مسوڵمانان، کەوا پێغەمبەر بە هەردوو هاوسەری فەرموە خۆتان دابپۆشن لەکاتێك، کە

ئـــيبن مـــەكتوم هاتۆتـــە خزمـــەتی، ئـــەوانیش گوتویانە ئەوە پیاوێكە نابینــێ، پێغەمبـەریش فـەرمووی: خـۆ ئێـوە كـوێرنین؟ ئـەدی ئێـوە نـــابینن؟ ئـەم فەرمودەیــە (شــاذ)ەو (صـحیح) نیە، چونكە پێچـەوانەی فـەرمودەی (صـحیح)ە سـەبارەت بـەم مەسـەلەیە. لـەو فەرمودانــەش پێغەمبـەر فەرمویـەتی: **((انما جعل الاستئذان من اجل البصر))** متفق على صحته. واتە: ئیزن وەرگـــرتن بـــۆ هاتنـــــە ژورەوە دانـــــراوە بـــۆ ڕەچاوكردنی بینین.

(فتاوى العلماء للنساء، لسماحة الشيخين، ابن باز وابن العثيمين، ص١٤٤).

## له كاتى زۆر توورەبون، تەلاق ناكەوێ

**پ ١٢١/ گەر پیاوێك تووڕە بوو، نەیدەزانی چی دەڵێ و لەوکاتەدا ژنەکەی تەڵاق بدات، ئایا تەڵاقی دەکەوێ؟**

وەڵام/ لەم حاڵەتەدا تەڵاقی ناکەوێت، چونکە لەوکاتەدا ئیرادەی لەدەست داوە. لە خاتو عائیشەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**لا طلاق وعتاق في اغلاق**)) رواه احمد وابو داود وابن ماجه، واتە: تەڵاق بە تووڕەبوون ناکەوێ، وشەی (أغلاق) بە تووڕەبوون ڕاڤەکراوە.

ئیبن تەیمیە گوتویەتی: وەك کە لە(زاد المعاد)یشدا هاتوە ڕاستیی زاراوەی (اغلاق) ئەوەیە، کە دڵی پیاو داخراوبێتو قسەکەی مەبەستی نەبێ، یان نەزانێ چی دەڵێ، وەك بڵێی مەبەستو ئیرادەی پیاو داخراوبێ.

(فقه السنة، المجلد الثاني، طبعة خاصة).

## ژنی بەڕۆژو بەزۆر بە جوتبونی مێردەکەی، کەفارەتی لەسەر نیە

پ ١٢٢/ لە ڕۆژی ڕەمەزان گەر ژن ومێرد بەڕۆژوبوون، ژنەکە بەرۆژ خەوتبوو مێردەکەی لەگەڵی جووت بوو، ئایا ئافرەتەکە دەبێ ڕۆژەکە قەزا بکاتەوەو کەفارەت بدات، کە دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوبونە؟

وەڵام/ گەر ژنەکە بەڕۆژ خەوتبوو، مێردەکەی لەگەڵێ جووت بوو، ئەوا تەنها ڕۆژوەکە قەزا دەکاتەوە، کەفارەتی لەسەرنیە.

ئەمەش بۆچونی حەنبەلییەکانە بە قیاسی ئیمام ئەحمەد، کە وەك تۆبزی لێکراو لەسەرجووت بوون قیاسکراوە: کە لەسەریەتی قەزای بکاتەوە ئافرەتەکە کەفارەتی لەسەرنیە، بە گوتەی ئیبن قدامە الحنبلی. هەروەها ئەمە بۆچونی ئیمام مالیکە.

(المفصل في احكام المراة، الجزء الثاني، ص٥٧).

## ژن‌ومێرد کە بەڕۆژوبوون بۆیان جائیزە یەکتری ماچ بکەن

**پ ١٢٣/ ئایا گەر ژن‌ومێرد بەڕۆژوبوون بۆیان جائیزە یەکتری ماچ بکەن؟**

وەڵام/ بەڵێ، ژن‌ومێرد گەر بەڕۆژوو بوون بۆیان جائیزە یەکتری ماچ بکەن، بەمەرجێ ماچکردن نەبێتە هۆی ئارەزوو بزوانێك، کە ئاوی بێتەوە. بەلگەی ئەمەش ئەوەیە، کە خاتو عائیشە (رەزای خوای لێبێ) گوتویەتی: کان رسول الله ﷺ ((یقبل وهو صائم، ویباشر وهو صائم، ولکنه کان املککم لإربه... پێغەمبەری خوا، بەڕۆژوبوەو ماچی کردوەو، دەستبازی‌و لە ئامێزی گرتوەو بەڕۆژو بووە، بەلام ئەو لە هەموتان زیاتر بەسەر داوێن‌و ئارەزوی زاڵتر بوو)).

بەلام گەر بەهۆی ماچ کردنەوەی ئارەزوو ببزوێ ئەوا جائیز نیەو نابێ یەکتری ماچ بکەن،

چونکە سەردەکێشێ بۆ جووت بوون.

عن أبی هریـرة: ((إن رجـلا سـأل رسـول الله ﷺ عن المباشرة للصائم فرخص لـه، وأتـاه آخـر فنهـاه عنهـا، فـاذا الـذي رخـص لـه شـيخ وإذا الـذي نهـاه شاب)).

سنن ابي داود، ج٧،ص١٣،لسنن الكبرى للبيهقي، ج٤، ص٢٣١.

کەواتــە بــۆ ئەوکەســە جـائیزە، گـەر لـەخۆی نەترسێ کە مەنی بێتەوە، بەڵام گەر ئاوی (مذي) هاتەدەرەوە، ئەوا ڕۆژووەکەی ناشکێ، وەك کە ئەبو حەنیفەو ئیمام شافیعی گوتویانە: ڕۆژو بـە ئـاوی (مذي) بـەتاڵ نابێتـەوە. مەبەست لـە (المباشـرة): دەستبازیو ماچ کردنو لەئامێز گرتنە.

(المفصل في احكام المراة، الجزء الثاني، ص٦٢-٦٤)..

## بە جیماع كردنی ئافرەتی ئیحرام بەستو، كە خەوتبێ، حەجەكەی بەتاڵ نابێتەوە

**پ ١٢٥/ گەر ئافرەتێك لە ئیحرام دابوو، خەوتبوو مێردەكەش لەگەڵی جووت بوو ئایا حەجی ئەو ئافرەتە بەتاڵ دەبێتەوە؟**

وەڵام/ بەلای حەنەفیەكان و حەنبەلیەكان حەجی ئافرەتی ئیحرام بەستوو بە جیماع بەتاڵ دەبێتەوە، گەر نووستبێ، یان نەنووستبێ. بەڵام لەلای شافیعییەكان حەجەكەی بەتاڵ نابێتەوە، چونكە بەلای ئەوان ئەو ئافرەتە وەكو ئەوە وایە، كە بەزۆر جیماعی لەگەڵ كرابێ و حەجەكەی پێ بەتاڵ نابێتەوە. كەواتە خەوتوش بەهەمان شێوەیە و حەجەكەی بەتاڵ نابێتەوە.

(المفصل احكام المرأة، الجزء الثاني، ص٢٤٦).

## ئافرەت بۆی جائیزە ئاژەڵ سەربڕێ

پ ١٢٥/ ئایا ئافرەت بۆی جائیزە پەلەورو ئاژەڵ سەرببڕێ؟

وەڵام/ بەڵێ، ئافرەت بۆی جائیزە پەلەوەرو ئاژەڵ سەربڕێ، بەڵگەش فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ((کاتێك جاریەکی کەعبی کوڕی مالك لە یەکێ لە چیاکانی مەدینە مەڕی دەلەوەڕاندو یەکێك لەو مەڕانە زامدار دەبێت، ئەویش دەگاتە سەری‌و بەبەردێك سەری دەبڕێ، جا لە پێغەمبەر ﷺ پرسیارکرا، کە حەڵاڵە، یان حەرامە، پێغەمبەر فەرموی بیخۆن)) ئیمام بوخاری لە (صحیحە)کەیدا ڕیوایەتی کردووە. لەمەوە بەدەرکەوت ئافرەت بۆی هەیە ئاژەڵ سەربڕێ، جا چ لەکاتی حەیز دابێت، یان ئەهلی کیتاب بێت.

ئیبن قدامە الحنبلی گوتویەتی: (ئەو سەربڕاوە حەڵاڵە جا ئەوکەسە پیاو بێت، یان ئافرەت).

لە کتێبی (کشاف القناع)ی فیقهی

حەنبەلییەكان هاتووە، كە بۆ سەربڕین چەند مەرجێكی هەیە، یەك لەوانە: ئەوكەسەی ئاژەڵ سەردەبڕێ، ژیر بێتو مەبەستی سەربڕین بێت، جا ئەوكەسە نێربێت، یان مێ.

لە (مغني المحتاج)ی فیقهی شافیعیەكان داهاتووە، كە سەربڕاوی دەستی ئافرەتی كیتابی (مەسیحی، جولەكە) حەڵاڵە.

ئیبن حەزمی ظاهری گوتویەتی: هەر سەربڕاوێكی دەستی جولەكە، یان گاور، یان ئاگرپەرست پیاو بێت، یان ئافرەت، ئەوا بۆمان حەلاڵە.

(المفصل احكام المرأة، الجزء الثالث، ص٢٨-٢٩).

## سەربڕینی ئاژەڵو پەلەوەر
## بە ئامێری کارەبایی، جائیزە

پ ١٢٦/ بۆ سەربڕینی ئاژەڵ یان پەلەوەر (مریشک) ئامێری کارەبایی بەکاردەهێنرێتو زۆرجار ئەم ئامێرە سەری ئاژەڵەکە لێدەکاتەوە، ئایا ئەم جۆرە سەربڕاوانە خواردنی جائیزە ؟

وەڵام/ مەرجی ئامێری سەربڕین ئەوەیە تیژ بێت، کە بەهۆی تیژیەکەیەوە مل لێ‌بکاتەوە، باشتریش وایە بۆ سەربڕین چەقۆ بەکاربهێنرێت. چونکە تیژەو بەزویی گیانی ئاژەڵەکە دەردەچێتو زۆر ئازاری پێ ناگات. گومانی تێدانیە، کە ئەم ئامێرە کارەباییە زۆر تیژو خێرایەو بە زویی سەری دەبڕێ‌و، زۆر هەستی پێ ناکات، کەواتە سەربڕین بەم جۆرە ئامێرە جائیزەو حەڵاڵە. جا گەر جاری واهەیە، کە تەنها سەری پەلەوەرەکە بەردەکەوێتو لێدەبێتەوە، ئەوا بەهەمان شێوە جائیزە،

ئەوەتا ئیمام ئەحمەد فەرمویەتی: گەر پیاوێك بەشمشێر لەسەری مراوییەك، یان مەڕێك بەمەبەستی سەربڕینی، بدات ئەوا بۆی هەیە سەربڕاوەکە بخوات.

(المفصل احكام المراة، الجزء الثالث، ص٣٢-٣٠).

## بۆ یەك شاری مانگ بینین، لەسەر هەموان پێویستە بەڕۆژو بن

پ ١٢٧/ گەر لە شاری وڵاتێك مانگ بینرا بۆ ڕەمەزان، یان مانگ بینرا بۆ جەژن، جا گەر وڵاتێکی تر نەیبینی، ئایا ئەوەی نەبینیوە جائیزە بەڕۆژوو ببێ، یان بیکاتە جەژن؟

وەڵام/ ... ڕە لەنێو ئیمامە بەڕێزەکان جیاوازی هەیە سەبارەت بەم مەسەلەیەو، بۆچونی وا هەیە، گەر لە شارێك مانگ بینرا، ئەوا لەسەر شارەکەی تر، کە نەیبینیوە پێویستە بەڕۆژوو ببێ، وەك حەنەفییەکان وایان گوتووە. هەیە بۆچونی وایە، گەر لە یەك شار مانگ بینرا،

ئـەوا لەسـەر هـەموو خـەڵك پێویسـت دەبێـت بەڕۆژووبن، وەك مەزهەبی حەنبەلیەکان.

هەیـە بـۆ چـونی وایـە، گـەر خـەڵکی شـارێك مانگیـان بینـی، ئـەوا خـەڵکی شـاری تـر، هـەمان حوکمیان دەکەوێتە سەر، بـەڵام بـەتێکڕای دەنـگ لەسـەر وڵاتـی دوور پێویسـت نیـە، کـە بـەڕۆژوو ببـێ، وەك ئەنـدەلوس‌و حیجـاز، کـە ئەمـەش مەزهەبی مالکییەکانە. هەیە بۆچونی وایە، گەر لە شارێك مانگ بینراو، لـە شارێکی تـر نـەبینرا، ئـەوا تەماشـا دەکـرێ، گـەر دوو شـار لـە یـەکتری نزیـك بـوون، ئـەوا حوکمیـان وەك حـوکمی یـەك شار وایە، گەر شارەکە مانگی بینی ئەوا پێویستە شـارە نزیکەکـە بـەڕۆژوو بـبن. کـە لـە یـەکیش دووربوون، ئەوا پێویست نیە شـارە دوورەکـە، کە مانگی نەبینیوە بەڕۆژوو ببێ، ئەمەش مەزهـەبی شافیعییەکانە: (گەر مانگ لـە شـارێك بینـرا ئـەوا لەسـەر هـەموو خـەڵك پێویسـت دەبێـت بـەڕۆژوو بـن)، هـەروەها گوتویانـە: (گـەر مـانگ بینـرا لـە شـوێنێکی نزیـك بێـت، یـان دوور ئـەوا لەسـەر

هـەموو خـەڵك پێويسـتە بـەڕۆژووبن، حـوكمى ئەوكەسـەى مـانگى نـەبينيوە، وەكـو ئـەو كەسـە وايە، كە مانگى بينيوە. چونكە پێغەمبـەرى خـوا ﷺ دەفـەرموێ: ((صـوموا لرؤيتـه، وافطـروا لرؤيتـه)) كـە مانگتـان بينـى بـەڕۆژووبن، كـە مانگتان بينى بيكەنە جەژن. ئەمەش خيتابە بۆ هەموو ئوممەت بەگشتى. لە كتێبى (المغني) ئيبن قدامـە الحنبلـى هـاتووە. گـەر خـەڵكى شـارێك مانگيـان بينـى، ئـەوا پێويسـتە هـەموو وڵاتـەكان بـەڕۆژوو بـبن، چـونكە خـواى گـەورە دەفـەرموێ: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُ﴾(البقرة- ١٨٥).

دياريشـە، كـە ئـەو ڕۆژەى ڕەمـەزان بـە شـايەتى چەند كەسێكى باوەڕپێكراوەوە دەچەسپێت، جا ئەوكاتە لەسەر گشت مسوڵمانان پێويست دەبێت بەڕۆژووبن.

بەڵام گەر لـە وڵاتێك ڕۆژ بـوو لـە وڵاتێكـى تـر شەو بـوو، ئـەوا هـەر وڵاتـە بـەپێى بينينـى خۆى بەڕۆژوو دەبێ، وەك وڵاتانى ئەورووپاو ئەمريكا.

سەبارەت بە بینینی مانگ بۆ جەژن، هەمان حوکمی سەرەوەی هەیە، کە ڕون کراوەتەوە.

(المفصل احكام المراة، الجزء الثاني، ص٢٩-٣٠).

## زەکات دەدرێ بە براو خوشکی هەژار

پ ١٢٨/ ئایا جائیزە زەکات بدرێت بە برا، یان بە خوشك، یان بە مام، گەر فەقیرو هەژار بون؟

وەڵام/ گەر یەکێك زەکاتی هەبوو جا چ پیاو بێ، چ ژن بۆی جائیزە زەکاتەکەی بداتە برای، یان خوشکی، یان پوری، یان مامی گەر فەقیرو هەژار بوون، تەنانەت زەکاتەکە دەبێتە خێرو بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم. ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((الصدقة في المسكين صدقة وفي ذوي الرحم صدقة وصلة)).

زەکات نادرێ بە باوكو دایك، چونکە لەسەر ئەوکەسە واجبە بەخێویان بکات.

(فتاوى العلماء للنساء، لسماحة الشيخين عبدالعزيز بن باز وابن العثيمين، ص٣٢).

## ئەو ژنەی مێردەكەی دەمرێ، دوای ماوەی چوار مانگ و دە ڕۆژ، دەتوانێ شو بكاتەوە

پ ١٢٩ / گەر ژن مێردەكەی مرد ئایا دەبێ ماوەی چەند تەعزیەدارو ماتەم بێ و مێرد نەكاتەوە؟

وەڵام/ گەر ژن مێردەكەی مردو، ژنەكە دووگیان (حامل) نەبوو، ئەوا لەسەری پێویستە ماوەی چوار مانگ و دەرۆژ ماتەمی خۆی ڕابگەیەنێ و تەعزیەداربێ و مێرد نەكاتەوە، حیكمەتیش لەمە ئەوەیە تاوەكو ڕەحمی پاك بێتەوەو وەفاداربێ بۆ مێردەكەی و ڕەچاوی مافەكانی مێردو خێزان بكات.

ئەو ئافرەتەی، كە مێردی دەمرێ تاماوەی چوارمانگ و دە ڕۆژ پێویستە لەسەری ئەمانەی خوارەوە پەیرەو بكات:-

١- لەماڵەوە بمێنێتەوەو نەچێتەدەر، بەڵام گەر كەسێك نەبوو كاری بازاڕی بۆ بكات، بۆی جائیزە بچێتەدەر بۆ كڕینی خواردەمەنی.

٢- خۆی دوربخاتەوە لە هەمو بۆنو عەترێك.
٣- جلوبەرگی جوان لەبەرنەكاتو ڕەشیش لەبەرنەكات، وەك نیشانەیەك بۆ تەعزیە.
٤- زێرو زیو بەكارنەهێنێو لەبەری نەكات، جا زێڕەكە گوارەبێت، یان خەناوكە، یان بازنگ .
٥- نابێ خۆی ئارایشت بكاتو كل لەچاوی بدات.
★ تێبینی: بەڵام گەر ژنەكە دووگیان (حامل) بوو، ئەوا بەدانانی حەملەكەی عیدەكەی تەواو دەبێت.

(فتاوى العلماء للنساء ، ص٩٤-٩٥).

## كە دەستنوێژ شكا، دەبێ لە نوێژ بێیتەدەر

پ ١٣٠/ گەر یەكێك لە نوێژدا بای لێبەربوو، یان یەكێك لەو شتانەی كە دەستنوێژ بەتاڵ دەكەنەوە لێی دەرچوو، ئایا حوكمەكەی وەك حوكمی میزەچركە وایە؟

وەڵام/ گەر لە نوێژدا نوێژكەر بای لێبەربو، یان میزی هاتەدەر، یان هەر شتێكی تر پێویستە

لەسەری لە نوێژەکە بێتە دەرەو، جائیز نیە لەناو نوێژەکە بمێنێتەوە، ئەگەر چی ئەوکەسە ئیمام بێت، یان (مأموم) بێت. ئەوکەسەی لەدوای ئیمامەوە نوێژی کردو دەستنوێژی شکا، ئەوا دەبێ لە نوێژەکە دەرچێو بچێ دەستنوێژ بگرێتەوەو، لەگەڵیان نوێژەکە بکاتەوە. گەر ئەوکەسەش ئیمام بوو بە یەکێك لە نوێژکەران دەڵێ فلانە کەس وەرەپێشەوە، یان گەر لە نوێژدا نەیدەتوانی خۆی بگرێ، بە واتای لەدەست خۆی نەبوو بایەکە دەهاتە دەرەوەو، ئەمەش بە بەردەوامی بێت، ئەوا حوکمی ئەوکەسە وەك حوکمی میزەچرکە وایە، دەبێ کە کاتی نوێژ هات، پارچە قوماشێك لە شوێنی دەرچونی بایەکە توند دەکاتو دەستنوێژ دەگرێ. جا گەر لەکاتی نوێژەکەدا شتێکی لێ دەرچوو ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوەو، نوێژەکەی تەواوە، با لە نوێژەکە دەرنەچێ خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ

﴿مَا ٱسْتَطَعْتُمْ﴾ (التغابن-١٦) ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾(البقرة-٢٨٦).

ئەو جۆرە کەسانەی کە بە بەردەوامی تووشی ئەم حاڵەتە بوون، بۆیان هەیە نوێژەکان (جمع) بکەن. (فتاوى العلماء للنساء، ص١٢٥-١٢٦).

## پشکنینی داوێنی ئافرەت بە هەرشتێك بێ، خۆشوشتن پێویست ناکات

پ ١٣١/ گەر ئافرەت دەستی بخاتە نێو داوێنی، جا بە مەبەستی دانانی مەرهەم بێت، یان بۆ پشکنینی پزیشکی و نەخۆشی ئافرەتان بێت، ئایا خۆشوشتنی دەکەوێتە سەر؟

وەڵام/ نەخێر، خۆشوشتنی ناکەوێتە سەر، بەڵکو دەبێ دەستنوێژ بشواتەوە.

اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء في المملكة العربية السعودية (اكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)، خالد الحسينات الطبعة الأولى ١٤٢٤-٢٠٠٣، ص٢٢-٢٣.

## پشکنینی پزیشکی بۆ داوێنی ئافرەت، ڕۆژو بەتاڵ ناکاتەوە

**پ ١٣٢/ ئەدی ئەگەر ئافرەت بەڕۆژوو بێت و پشکنینی پزیشکی لە داوێنیەوە بۆ بکرێت، یان مەرهەمی بکات لە ناوەوە، ئایا ڕۆژوەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؟**

**وەڵام/ نەخێر، ڕۆژوەکەی ناشکێ و بەتاڵ نابێتەوە. اللجنة الدائمة..(اكثر من١٠٠٠ جواب للمراة)، ص١٥٧.**

**جێی ئامازەیە، کە لە شاری هەولێر دوو مامۆستای بەڕێز بەبێ بەڵگە فەتوایاندا، کە پشکنینی پزیشکی لە داوێنی ئافرمت (واتە بە پەنجە) ڕۆژوی ئافرەتەکە دەشکێ و بەتاڵە، بەڵام فەتواکەیان بێبەڵگەی شەرعیەو هیچ دەقێك لە قورئان و سوننەت و وتەی شەرعناسان لەمبارەوە نەهاتووە.**

**لەڕاستیدا بەم فەتوایەیان، سەریان لە ئافرەتان شێواندو دینیان لەسەر زەحمەت کردن، کە لە**

بنەڕەتدا دین ئاسانکاریە، نەك توندکردنو زیادەڕۆییکردن.

## دوای خۆشوشتن، بە هاتنە دەرەوەی مەنی خۆشوشتن پێویست نیە

**پ ١٣٣/ گەر یەکێك بۆ جەنابەت خۆی بشوات، پاشانت کە لە خۆشوشتن بۆوە، مەنی بێتە دەرەوە، پێویستە دوبارە خۆی بشوات؟**

وەڵام/ پێویست ناکات دوبارە خۆی بشوات، مادام بە تەواوی خۆی شوشت، ئەم مەنییە هیچ نیە، چونکە بەبێ ئارەزو (شهوة) دەرچووە، حوکمی وەك حوکمی میزە، دەبێ بشورێو دەستنوێژی بۆ بشۆرێتەوە، بەڵام گەر بە ئارەزووەوە بەهۆی ماچو دەستبازیو وروژاندنی ئارەزووەوە، مەنی دەربچێت، ئەوا مەنییەکە نوێیە، دەبێ خۆی بۆ بشورێت.

الشیخ بن باز (اکثر من١٠٠٠ جواب للمرأة)، ص ٣٧.

# چۆنیەتی خۆشوشتنی لەش پیس

پ ١٣٤/ ئایا خۆشوشتن بۆ لەش پیسی (جەنابەت، حەیز، زەیستان) چۆن ئەنجام دەدرێت؟

وەلام/

١- لە دڵدا نیەتت هەبێ، کە خۆت بۆ لەش پیسی دەشۆیت.

٢- دەڵێی (بسم الله).

٣- سێ جار دەستەکانت دەشۆی.

٤- داوێن و لەشت دەشۆی، ئەو شوێنەی کە شوێنەواری مەنی پێوەیە.

٥- ئنجا سێ جار ئاو بەسەر سەرت دادەکەی، تا دەگاتە ناو موەکانی قژت، ئنجا جەستەت دەشۆی.

٦- شوشتنی جەستەش لە لای ڕاستەوە دەست پێدەکەی، ئنجا لای چەپ و دەستیان پێدادێنی.

الشیخ ابن جبرین (اكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة) ص٢٥.

## ئیفرازاتی ڕێڕەوی منداڵ بون پاکە

پ ١٣٥/ ئەو ئیفرازاتەی لە داوێنی ئافرەت دەردەچێت پاکە، یان پیسە، ئایا دەستنوێژ دەشکێنێ ؟

وەڵام/ ئافرەت دوو ڕێڕەوی هەیە، کە دەرهاوێژ (افرازات)ی لێ دەردەچێت، کە هەمویان دەستنوێژ دەشکێنن:

ڕێڕەوێک، کە میزی لێ دەردەچێت، جا ئیفرازاتی ئەم ڕێڕەوە پیسەو دەستنوێژ دەشکێنێ، چونکە بەزۆریی لە میزڵدانەوە دەردەچێت.

هەروەها ڕێڕەوێکی تر هەیە، کە منداڵ لێ لەدایک دەبێت، ئیفرازاتو تەڕایی ئەم ڕێڕەوە، پاکەو جلو پۆشاکو جەستە پیس ناکات، بەڵام دەستنوێژ دەشکێنێ.

ئەو ئاوەی بە بەردەوام لە منداڵدان (رحم)ی ئافرەت دەردەچێت، پاکەو با ئافرەت کاتێک

دەستنوێژی بۆ بشوات، کە کاتی نوێژەکە هاتووە، جا ئەوکاتە دوای کاتی نوێژەکە، بە ئارەزوی خۆی چەند نوێژی فەرزو سوننەتی ویست بیکاتو قورئان بخوێنێ. کەواتە ئەم ئاوە، گەر بە جلو بەرگ بکەوێت ناشورێ چونکە پاکە.

الشيخ ابن عثيمين (اكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة) ص ٦٢.

## بۆ زەرورەت بەستنی منداڵدان جائیزە

پ ١٣٦/ ئایا بەستنی منداڵدان (رحم) جائیزە؟

وەڵام/ بۆ زەرورەت جائیزە، وەك ئەوەی ژن شەکرەی هەبێو، منداڵ بوون بە سروشتی نەبێت.

الشيخ بن باز (اكثر من١٠٠٠جواب للمرأة) ص٧١.

## ژنی زەیستانی نابێ تەڵاق بدرێ

پ ١٣٧/ گەر ژن زەیستان بوو، لەو حاڵەتەدا تەڵاقدانی جائیزە؟

وەڵام/ جائیز نیە تەڵاق بدرێ.

الشيخ عثيمين (اكثر من ١٠٠٠ جواب للمراة) ص ٨٦.

## تەنها هەست كردن بە هاتنەدەرەوەی میز، نوێژ بەتاڵ ناكاتەوە

پ ١٣٨/ گەر یەكێك لەكاتی نوێژدا هەستی كرد میزی لێدەردەچێت، ئایا نوێژەكە بەتاڵ دەكاتەوە؟

وەڵام/ ئەم هەست كردنە دەستنوێژ ناشكێنێو نوێژ بەتاڵ ناكاتەوە، چونكە تەنها وەسوەسەی شەیتانە. كاتێك نوێژەكە بەتاڵ دەبێتەوە، مەگەر ئەوكەسە دڵنیابێ، كە مێز دێتە دەرەوە.

الشيخ بن باز (اكثر من ١٠٠٠ جواب للمراة)، ص ١٢٨.

## چۆنیەتی نوێژی (استخارة)

**پ ١٣٩/ نوێـژی (اسـتخارة) چـۆن ئـەنجام دەدرێ؟**

وەڵام/ وەك نوێژە سوننەتەكان دوو ڕكعات نوێـژ دەكـەیت، لەدڵـدا نیـەتی نوێـژی (اسـتخارة) دێنیـت. دوای سـەلامدانەوە دوعاكـەی دەكرێـت، كە بەم شێوەیە:

اللهُـمَّ إنّــي أسـتخيرُكَ بعِلمِــكَ، وَأسـتقدِرُكَ بقدرَتِكَ، وَأسألُكَ مِنْ فضلِكَ العَظِيم فإنَّكَ تقـدِرُ وَلا أقدِرُ، وَتعلمُ وَلا أعلمُ، وَأنتَ علاّمُ الغيُوبِ، اللهُمَّ إن كُنتَ تعلَـمُ أنَّ هـذا الأمْـرَ خيْـرٌ لِي فِي دِينِـي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أمْرِي أوْ قَالَ: عَاجِلِ أمْرِي وَآجِلِهِ، فاقدُرْهُ لِي وَيسِّرْهُ لِي ثمَّ بَارِكْ لِـي فِيـهِ، اللهُـمَّ وَإنْ كُنتَ تعلمُ أنَّ هذا الأمْرَ شرٌ لِي فِـي دِينِـي وَمَعَاشِـي وَعَاقِبَــةِ أمْــرِي أوْ قَــالَ : عَاجِـلِ أمْــرِي وَآجِلِــهِ، فاصْـرِفهُ عَنّـي وَاصْـرِفنِي عَنـهُ وَاقدُرْ لِـي الخَيْـرَ حَيْثُ كَانَ ثـمَّ ارْضِنِـي بِـهِ. وَيُسَمِّي حَاجَتـهُ) وَفِـي

رواية ( ثمَّ رَضَنَي به) رَوَاهُ البُخَارِيُّ (١١٦٦).

الشيخ بن باز (اكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)، ص ١٣٨.

## لە کاتی بەڕۆژوبوندا، دەکرێ بە مەعجونی ددان، ددان بشۆرێ

پ ١٤٠/ لە کاتی بەڕۆژوبوندا، بۆ ددان شوشتن، ئایا دەکرێ مەعجونی ددان بەکاربهێنی؟

وەڵام/ بەڵێ، هیچی تێدانیە مەعجونی ددان بەکاربهێنرێ، بەڵام دەبێ ئاگاداربی قوتی نەدەیت.

هەروەها لە کاتی بەڕۆژوبوندا، لە لای پزیشك ددان پاك بکرێتەوەو پڕ بکرێتەوەو دەربهێنرێ، بەڵام دەبێ ئاگادار بی لە قوتنەدانی هیچ شتێ لە دەرمانەکە، یان خوێن، باشتریش وایە لە کاتی بەڕۆژوبوندا ئەم کارە نەکرێت.

الشيخ بن باز (اكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)، ص١٦٠.

## قەترەی گوێو چاو بەکارهێنانی (بەخاخ) ڕۆژو ناشکێنێ

پ ١٤١/ لەکاتی بەڕۆژوبوندا، دەکرێ قەترەی گوێو چاوو (بەخاخ) بەکاربهێنرێ، ئایا ڕۆژوی پێ دەشکێ؟

وەڵام/ قەترەی گوێو چاو، ڕۆژو ناشکێنن، بەڵام گەر چوە قورگەوە، ئەوا باشتر وایە ڕۆژوەکە قەزا بکاتەوە، بەڵام لەسەری واجب نیە قەزای بکاتەوە.

سەبارەت بە (بەخاخ)، ئەویش لەکاتی پێویستو زەرورەت، قەیناکە، بەڵام گەر بکرێ بۆ دوای فتارکردنەوە بەکاربهێنرێت، ئەوا باشترە.

الشيخ بن باز (اكثر من١٠٠٠ جواب للمرأة)، ص١٦٠.

## قورئان خوێندن بە لەبەرو بە بێدەستنوێژ جائیزە

**پ ١٤٢/ ئایا قورئان خوێندن بێلەبەرو بەبێ دەستنوێژ جائیزە؟**

وەڵام/ دروستەو هیچی تێدا نیە.

الشیخ بن باز (اكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)، ص١٩٨.

## پارە وەرگرتن بۆ قورئان خوێندنەوە جائیز نیە

**پ ١٤٣/ گەر یەکێك بەکرێو بەپارە قورئان بخوێنێتەوە، ئایا ئەو کەسە گوناهبارە؟**

وەڵام/ جائیز نیە، هەرکەسێك کرێو پارە وەربگرێ بۆ قورئان خوێندنەوە، ئەوا ئەو کەسە گوناهبارەو پاداشتی بۆ نانوسرێ، چونکە خوێندنەوەی قورئان عیبادەتە، عیبادەتیش نابێو، جائیز نیە بکرێتە هۆی دنیایی.

بەلاّم یەکێك بەکرێ بگیرێ قورئان فێری خەڵك بکات، ئەوەیان جائیزە.

اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء في المملكة العربية السعودية، (أكثر من١٠٠٠ جواب للمرأة)، ص٢٠٤.

## کردنی نێوان برۆکان جائیزە

پ ١٤٤/ ئایا جائیزە مووی نێوان برۆکان بکرێت؟

وەلاّم/ بەڵێ، جائیزە، چونکە لە بنەڕەتدا ئەم مووە بە برۆ دانانرێ.

اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء في المملكة العربية السعودية (اكثر من١٠٠٠ جواب للمرأة)، ص٢٥٩.

## گۆشتی هاوردەکراو، حەڵاڵە یان حەڕامە؟

پ ١٤٥/ ئەو گۆشتانەی لە دەرەوە هاوردە دەکرێ، ئایا خواردنی جائیزە؟

وەڵام/ گۆشتی هاوردە (مستورد)، سێ حاڵەتی هەیە:

١- بزانین کە لەسەر شەریعەتی ئیسلام سەربڕاوە، کە ((ناوی خوای لێهێنراوە (بسم الله)ی لێکراوە..)) ئەمەیان حەڵاڵە.

٢- بزانین کە لەسەر شەریعەتی ئیسلام سەرنەبڕاوە... ئەمەیان خواردنی جائیز نیە.

٣- گومانمان هەبێ، کە ئایا بە شێوەیەکی دروست سەربڕاوە، یان نا؟ حوکمی ئەم گۆشتە، حەڵاڵە، پێویستیش ناکات پرسیار بکەین، یان لێبکۆڵینەوە، کە چۆن سەربڕاوەو، ئایا (بسم الله)ی لێکراوە، یان (بسم الله)ی لێنەکراوە.

الشيخ ابن عثيمين (اكثر من١٠٠٠ جواب للمرأة)، ص٤٢٢.

**نەوا محمد سعید:**

- لە ساڵی ١٩٦٥ لە شاری کۆیە لەدایك بوە.
- قۆنـــاغی ســـەرەتایی و ناوەنـــدی و ئامـــادەیی لەکۆیە تەواوکردووە.
- لە ساڵی ١٩٩٠ ئەندامی کۆمەڵەی خۆشنووسانی عێراق بووە.
- ئەندامی کۆمەڵەی خۆشنوسانی کوردستانە.
- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان بووە.
- ئەنـدامی کـارای ســەندیکای رۆژنامەنوســانی کوردستانە.
- ئەندامی رۆژنامەنوسانی نێودەوڵەتی (IFJ) ە

.

- لـە ســاڵی١٩٨٠ بەشـداری کـردووە لـە پیشـانگای دواناوەندی کۆیەی کوڕان، کـە لـە شـاری کۆیـە لەگـــــەڵ فوتابخانـــــەکانی دی (چـــــالاکی فوتابخانەکان ساز کرد).

- لە ساڵی ١٩٨١ بەشداری کردووە لە پیشانگای مەڵبەندی لاوانی کۆیە کە لە هۆڵی قوتابخانەی دواناوەندی کۆیەی کوڕان لە شاری کۆیە ساز کرا.
- لە ساڵی ١٩٨٢ بەشداری کردووە لە پیشانگای تایبەتی قوتابخانەی دواناوەندی کوڕان لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی لە شاری کۆیە ساز کرا.
- لە ساڵی ١٩٨٢ بەشداری کردووە لە پیشانگای مەڵبەندی لاوانی کۆیە کە لە شاری سلێمانی لەسەر ئاستی حوکمی زاتی سازکراو توانی پلەی یەکەم بەدەست بێنیو خەڵات بکرێ.
- لە ساڵی ١٩٨٣ بەشداری کردووە لە پیشانگای مەڵبەندی لاوانی کۆیە کە لە شاری سلێمانی لەسەر ئاستی حوکمی زاتی سازکراو توانی پلەی دووەم بەدەست بێنیو خەڵات بکرێ.
- لە مانگی (١٢)ی ساڵی ١٩٨٧ بەشداری کردووە لە پیشانگای رۆشنبیریو جەماوەر (الثقافة والجماهیر) کە لە هۆڵی قوتابخانەی (أولی)ی

سەرەتایی لە کۆیە سازکراو بە (١٠) تابلۆ بەشداری کرد.

- لە (١٩٨٨/٢/٨) بە (٢٠) بیست تابلۆ بەشداری کردووە لە پیشانگای هونەرمەندانی کۆیە کە تیپی باواجی کۆیە پێی هەڵسابوو لە قوتابخانەی (أول)ی سەرەتایی کۆیە.
- لە (١٩٨٩/٨/٢٠) بە هاوکاری تیپی باواجی کۆیە پیشانگایەکی تایبەتی لە هۆڵی قوتابخانەی (ئاسۆس)ی سەرەتایی لە شاری کۆیە کردۆتەوە کە (٢٠) تابلۆی لەخۆ گرتبوو.
- لە ساڵی ١٩٩٣ بە (٥) تابلۆ بەشداری کردوە لە پیشانگای مەڵبەندی لاوانی کۆیە.
- (٢٠٠٠/١٠/١) بە (٤) تابلۆ بەشداری لە ڤیستیڤاڵی دووەمی هەولێر بۆ خۆشنووسیو نەخشەسازی کردووەو بڕوانامەی ڕێزلێنانی پێدراوە.
- بە خەتی نەسخو دیوانیو تەعلیق بەشداری کردووە پێشبڕکێی دەولی پێنجەمی خۆشنووسی

بەناوی (سید ابراهیم) کە لە ٢٠٠١ لە ئەستانبول سازدرا.

- بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی خۆشنووسی خاچی سووری نێونەتەوەیی کە لە (٢٠٠١/١٠/١٤) سازکراو بڕوانامەی ڕێزلێنانی پێدراوە.
- بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی کۆمەڵەی خۆشنووسانی کوردستان لەسەر ئاستی هەولێر کە لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٢ سازدرا، ئەوەبوو لە خەتی نەسخ پلەی یەکەمی بەدەست هێنا.
- لە ڕۆژنامەی هاوکاریو پاشکۆی عێراقو ئاسۆ، سەبارەت بە هونەری خۆشنووسی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازدراوە.
- بە خەتی دیوانی بەشداری کردووە پێشبڕکێی دەولی شەشەمی هونەری خۆشنووسی بەناوی (میر عماد الحسنی) کە لە ٢٠٠٤ لە ئەستانبول سازکرا.
- لە ٢٠٠٤/٧/١٨ بەشداری کردووە لە پیشانگای خۆشنووسانی هەولێر، کە بەڕێوەبەرایەتی

رۆشنبیری و هونەری پارێزگای هەولێر بۆ (٢٠) خۆشنوسی سازکردبوو، لەژێر ناونیشانی ((پیتە ڕەنگینەکان لە سایەی ئازادیدا)).

- لە مانگی ئاداری ٢٠٠٥ بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی خۆشنووسانی کوردستان، کە لە هەولێر ساز درابوو، لە خەتی دیوانی پلەی دووەمی بەدەست هێناو، لە خەتی (نەسخ)یش پاداشت (مكافأة).
- لە (٢٠٠٦/٢/١٥) بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی قەڵاومنارە بۆ خۆشنووسی کە لەسەر ئاستی کوردستان لە هەولێر سازدرابوو، لە خەتی دیوانی پلەی یەکەمی بەدەست هێناو خەڵاتی پێبەخشرا.
- لە ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی خۆشنووسی بەناوی (عبدالحمید الکاتب) کە لە سوریا سازدرابوو. بڕوانامەی ڕێزلێنانی پێبەخشرا.
- لە (٢٠٠٧/٢/٢٦) بەشداری کردووە لە پێشانگای کۆڕبەندی هزری ئیسلامیی بۆ خۆشنووسی،

که له هەولێر له هۆڵی خانزاد ساز درابوو.

- له (٢٠٠٧ /٢/٢٨) به خەتی دیوانی بەشداری کردووه له پێشبڕکێی حەوتەمی جیهانی هونەری خۆشنووسی به ناوی (هاشم محمد البغدادی) که له تورکیا ساز درابوو.
- له (٢٠٠٧ /٣/٣١) بەشداری کردوه له پێشانگای فۆتۆکۆپی تابلۆی پێشبڕکێی خۆشنووسانی کوردی بەشدار بوو له پێشبڕکێی حەوتەمی جیهانی – تورکیا به ناوی خۆشنووس (هاشم محمد البغدادی) که له هەولێر له بارەگای کۆمەڵەی خۆشنووسان ساز کرابوو.
- به(١١)تابلۆ بەشداری لەپێشەنگای خۆشنوسی هاوبەشی تیپی هونەری بەیان و کۆمەڵەی خۆشنوسانی کوردستان بەبۆنەی یادی لەدایکبونی پێغەمبەر ﷺ کردووه، که له ٢٠٠٩/٣/٢٤ لەگەری شانەده له هەولیر سازکرا بوو.
- بەشداری لەپێشبڕکی نۆیەمی کۆمەڵەی خۆشنوسانی کوردستانی کردووه به ناوی

(شەهید حاجی خەلیل زەهاوی )، کە لە ٢٠٠٩/٤/٢ لەسەر ئاستی کوردستان سازکرا بوو، خەڵاتی تایبەتی پێ بەخشرا.

- بەشداری کردووە لە دووەمین پیشبرکێی کۆمەڵەی خۆشنوسانی کوردستان - سلیمانی - بەناوی خالد زامدار لە ١٨ - ٨ - ٢٠٠٩ کە لەسەر ئاستی کوردستان سازکرابوو پلەی دووەمی لە خەتی دیوانی بە دەستهێنا.
- لەساڵی ٢٠١٠ بە خەتی دیوانی بەشداری کردووە لە پێشبڕکێی هەشتەمی جیهانی هونەری خۆشنووسی بەناوی (بدوی الدیرانی).
- ناونیشانی زیاتر لە ٢٠٠ کتێب ونامیلکە نوسیوە.
- ناونیشانی چەند گۆڤارێکی نوسیوە وەك : جەماوەر ، سنور ، پەیرەو ، پەیام ، فریا ، مێرگی منداڵان و ژینی نوێ.

جگە لەم بەهرەیە، خوای گەورە بەهرەی وەرگێڕانی کتێب لە زمانی عەرەبی بۆ کوردی

پێ بەخشیوە، جا ئەم بەرهەمانەی خوارەوەی بۆ بڵاوکراوەتەوە.

١- ژن‌و مێردی ئیسلامی بەختەوەر (حەفت جار چاپ کراوەتەوە). چاپی یەکەمی ساڵی ١٩٩٦.
٢- سوپاکەی پێغەمبەرﷺ.
٣- چەند وانەیەك لە پێغەمبەری سەرکردە لە شاراوەی نهێنی دا.
٤- چۆن بونیەو بناغەی ئیسلامیمان لە ڕوخان دەپارێزین.
٥- ٣٠ نیشانەی مونافیقان (دو جار چاپ کراوەتەوە).
٦- مەرجەکانی حیجابی ئافرەتی مسوڵمان لە قورئان‌و سوننەتدا (دو جار چاپ کراوەتەوە).
٧- باڵاپۆشی ئافرەتی مسوڵمان (چوار جار چاپ کراوە).
٨- ئایا دەزانی جۆرەکانی شیرك چین؟

٩- ئایا دەزانی جۆرەکانی کوفر چین؟
١٠- ئایا دەبێ ولاء و براءمان بۆ کێ بێ؟
١١- منداڵی مسوڵمان چی دەڵێ؟ (دە جار چاپ کراوەتەوە).
١٢- تفسیری جوزئی عەممە. (دوو جار چاپ کراوەتەوە).
١٣- حەج، عومرە، زیارەت لەگەڵ دوعاکان.
١٤- ئادابی کۆمەڵایەتی لە قورئان و سوننەتدا. (سێ جار چاپ کراوەتەوە).
١٥- زیکرەکانی بەیانیان ئێواران. (دوو جار چاپ کراوەتەوە).
١٦- لە فیقھ شارەزا بە بە پرسیارو وەڵام (دوجار چاپ کراوەتەوە).
١٧- گوڵبژێرێك لە فەتوای هاوچەرخ سەبارەت بە ئافرەتان (چوار جار چاپ کراوەتەوە).
١٨- فرەژنی لە نێوان فیقهی ئیسلامو ویستی پیاودا.
١٩- خێزانەکەت بە پارە مەزەندە ناکرێت.

٢٠- كــج لــه نێــوان واقيعــى ئيســلامو دابو نەريتى جاهيليدا.
٢١- وێنەى سەر تابلۆو وێنـەى فۆتـۆغرافى لـه ڕوانگەى ئيسلامدا.
٢٢- مافەكانى ژنو مێرد له ئيسلامدا.(دوجار چاپ كراوه).
٢٣- تەفسيرى جوزئى تەبارەك.
٢٤- الاصول الثلاثة به كوردى

# پێڕست

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|